# پەروەردەوزانست





ناوەڕۆك



ژمارە (١٧)
پاییزی ١٩٨٠

گۆڤارێكی پەروەردەیی وزانستییە بەڕێوەبەرێتی گشتیی خوێندنی كوردی
بە سێ مانگ جارێ دەری دەكات

# پەروەردە وزانست

گۆڤارێکی پەروەردەیی و زانستییە بەڕێوەبەرێتیی

گشتیی خوێندنی کوردی بە سێ مانگ جارێک دەری دەکات

لیژنەی گۆڤار ـ عبداللە فرج اسماعیل شاڵی
سامی عزیز رسول
عبدالرزاق حمد بیمار
عثمان علی الشیخ

ناونیشان : بغداد ـ شارع السموأل ـ مدیریة الدراسة الكردیة العامـــة

ژمارە ( ١٧ ) ساڵی ١٩٨٠

دانەی بە (١٠٠) فلسە

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا
( ١٨١ ) ساڵی ١٩٨٠

چاپخانەی (دار العراق)

# ( سەر ) و ( چاو ) و ( دڵ ) و ( دەست ) لەوشەسازیی زمانی کوردیدا

عبدالله شالی

لە دروستکردنی زاراوەی کوردیدا بۆ هێنانەدیی واتایەکی تازە چەند رێگایەك بەکاردێت لەوانە :

(١) بە دانانی وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك یان پێشگرێکدا بۆ نموونە : زان + ا = زانا ، لێ + کەوتن = لێکەوتن ، ترش + ۆکە = ترشۆکە ، پان + ایی = پانایی ... هتد .

(٢) بە دانانی دوو وشەی واتادار یا پتر بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی ( ە ) یا بێ یاریدە دەدرێتە پاڵ یەکتروەك : گەڵا + توو = گەڵاتوو ، رەش + ە + با = رەشەبا ، سەوز + ە + گیا = سەوزەگیا ، دەست + ە + برا = دەستەبرا .. هتد .

بەم جۆرە زمانی کوردی توانیویەتی سەدەها وشەی تازە داڕێژێتو لێکبدات بۆ دەربڕینی واتایەکی تازە لە ئاخاوتنو نووسیندا . ئێمە لێرەدا تەنیا دەربارەی ئەم چەند ئەندامەی لەش ( سەر ، چاو ، دڵ ، دەست )و بەکارهێنانیان بۆ واتای تازە دەدوێین :

١ ـ سەر :

بە سەری من ـ بۆ رێزگرتنو سوێندخواردن .

بەسەر سەر ـ بۆ بەڵێندانو جێبەجێ کردنی کارێك .

سەرو یەك ، دوو ، سێ ـ بۆ دابەشکردن .

سەری ساڵ ـ کۆتایی ساڵ ، یان دەستپێکردنی ساڵی تازە .

بەسەر چاو ـ بۆ بەڵێندانو جێبەجێ کردنی کارێك .

سەر بە ـ ئەو کوڕە سەر بە خۆمانە ـ لایەنگیرمانە .

سەر بە سەر ـ بۆ قورسایی‌و کێشان

سەربەرەوژێر ـ واتاکەی روونە .

سەربەرەوژوور ـ واتاکەی دیارە .

سەر لە بەیانی ـ بەیانی زوو .

سەر لە ئێوارێ ـ ئێوارە زوو .

سەر لە نیوەڕۆ ـ نزیك نیوەڕۆ .

سەرلەنوێ ـ بەتازەیی ، دووبارە .

سەرتاپا ـ لەسەرەوە تانووکی پێ ، هەمووی .

تاسەر ــ تادوایی ٠

بەسەربردن ــ کاتڕابواردن ــ جێبەجێکردن ٠

سەربڕین ــ واتاکەی دیارە ٠

سەرهەڵبڕین ــ واتاکەی دیارە ٠

سەرپێوەبوون ــ تووشبوون ٠

چوونبەسەردا ــ لەپڕ بچیت بەسەر شتێك یا کارێکدا ٠٠ هتد ٠

بەسەرچوون ــ تەواوبوون ــ تێپەڕ بوون ٠

سەرلێدەرچوون ــ دەرکردن ــ تێگەیشتن لە کارێك ٠

سەرلێ تێکچوون ــ نەزانی چی بکەیت لە کارێکدا ٠

سەرتێداچوون ــ کوژران یان نەمان لە پێناوی کارێکدا ٠

سەرلێدان ــ چوونە لای کەسێك ٠

بەسەرکردنەوە ــ چوونە لای کەسێك ــ پشکنین ٠

سەرنیشان ــ واتەکەی روونە ٠

سەرنیشاندن ــ بوون بەهۆی سەرنیشانی کەسێك ٠

سەرگرتن ــ بۆ خانوو ، بۆ قاپ یان دەفر یان سەرکەوتن لە کارێکدا ٠

سەریخۆهەڵگرتن ــ ماڵ بەجێهێشتن بۆ شوێنێکی نەزانراو ٠

سەرهێنانو سەربردن ــ بیرکردنەوە لە شتێك کە تێی ناگەیت ٠

سەرێکەوهیناوە ــ بڕیاردان لەسەر کارێكو پاشگەز نەبوونەوەی .

سەرداهێنان ــ واتاکەی دیارە .

سەردەهێنان ــ بەرزبوونەوەی ڕووەك

سەردەرهێنان ــ بەرزبوونەوەی ڕووەك لەژێر زەوی ( ڕوواوە ) ٠

سەرژماردن ــ ژماردنی دانیشتووان ٠

سەرانە ــ باجدان ( بە زۆر یا بە خوایشت ) ٠

سەرکەوتن ــ واتاکەی دیارە ٠

سەرکەوتوو ــ کەسێکی ئازاو زیرەكو وریا لە کاروباری خۆیدا ٠

سەرکردن ــ ئەم تەرازووە سەردەکات یا تفەنگەکە سەریکرد ٠

سەرلێدەرکردن ــ زانین ــ تێگەیشتن لە کارێك ٠

سەرکردنەسەر ــ وەڕسکردنی کەسێك ٠

بەسەرکردن ــ ئامۆژگاری کردن ٠

سەردانان ــ لە پێناوی کارێکدا ٠

سەرنانەوە ــ مردن ٠

سەردانەواندن ــ شلبوون بۆ کەسێك

یا کارێك ٠

سەرپێدانەواندن ـ بەزۆر سەر بە یەکێك دانەواندن ٠

سەرلێشێوان ـ تێکچوون لە کارێکدا ٠

سەرتاشین ـ واتاکەی روونە ( بۆ ئابڕووبردنیش بەکاردێت ) ٠

سەرخستن ـ کارێك یا کەسێك یا شتێك سەرخەیت ٠

سەرخواردن ـ سەرەخۆرە ـ یەکێك یا منداڵێك ببێت بەهۆی مردنی باوکی یا کەسێکی ٠

سەرۆك ـ گەورەی وولات ٠

سەرانسەر ـ لەم پەڕەوە بۆ ئەوپەڕ ٠

سەراپا ـ سەرتاپا ٠

چوونەسەرئاو ـ دەست بە ئاو گەیاندن ٠

سەربان ـ واتاکەی روونە ٠

سەرباقی ـ چی مایەوە ٠

سەرباز ـ واتاکەی روونە ٠

سەربەگێچەڵ ـ یەکێکی تووشو شەڕانی

سەربەگۆبەند ـ سەربەگێچەڵ ٠

سەربەکڵاوە ـ بەفرباریین بە کلووی زلزل ٠

سەربەرز ـ نەترسو مەردو پاك ٠

سەربەرزی ـ ناوە بۆ سەربەرز ٠

سەربەست ـ کەسێکە ئازاد

سەربەستی ـ ناوە بۆ سەربەست ٠

سەربەخۆ ـ ئازاد ٠

سەربەخۆیی ـ ناوە بۆ ئازاد ٠

سەرچاوە ـ کانی یا بنەڕەتی کارێك ٠

سەرچەوت ـ مرۆڤێکی خوارو ناڕاست ٠

سەرچۆپی ـ یەکەم کەس لە ریزی هەڵپەڕیندا ٠

سەردەمێ ـ جارێك ـ رۆژێ لە رۆژان ٠

سەردەقشکان ـ یەکەم کەس کە تووشی کارێك بێت ٠

سەردەستە ـ گەورەی تاقمێك ٠

سەرەبزوت ـ دار کە بەشێکی سووتابێ ٠

سەرەگوریس ـ کۆتایی یا دوایی پەت یا گوریس ٠

سەرئەنجام ـ دووایییەکەی ٠

سەرەنوێلك ـ گردۆلکەیەکە لە پەینو زبڵ لەبەر ماڵانی گونداندا ٠

سەرەڕای ـ لەگەڵ ئەوەشدا ٠

سەرەڕێ ـ لەسەر ڕێگا ٠
سەرەڕێپێگرتن ـ یەکێك ڕێگا لە یەکێکیتر بگرێت ٠
سەرەتا ـ لە دەستپێکردنەوە ٠
سەرەتاتکێ ـ جار جار خۆپێشاندان بە دزییەوە ٠
سەرەونخون ـ سەرەوخوار ٠
سەرەنگوم ـ بزربوونی کەسێك و نەمانی ٠
سەرەخولێ ـ گێژبوون ٠
سەرگەردان ـ نەگبەتیو کلۆلیو لێقەوماندن ٠
سەرگەرم ـ بەتینو گورج ٠
سەرگروشتە ـ ڕووداو ٠
بەسەرهات ـ ڕووداو
سەر + نج ـ ئاگاداربوون ٠
سەر + ین ـ واتاکەی دیارە ٠
سەرکەچ ـ پەستو دڵتەنگ ٠
سەرکەف ـ جۆرێکە لە مسابوون ٠
سەرکەل ـ بەرزترین شوێنیگردێك ٠
سەرکێش ـ ئاژەڵێکی یا کەسێکی چەوتو نالەبار ٠
سەرکێشی ـ ناوە بۆ سەرکێش ٠
سەرکردە ـ گەورەی کۆمەڵێك ٠
سەرکار ـ واتاکەی ڕوونە ٠

سەرکز ـ پەستو دڵتەنگ ٠
سەرکۆمار ـ سەرۆکی وولاتێك ( سەرۆکی فەرماندە ) ٠
سەرکۆزەرە ـ پاشماوەی پاككردنەوەی دانەوێڵە ( لە بەردو چیلکەو پووش ) ٠
سەرکوێر ـ سەرلێتێکچوو ـ سەرلێشێواو ٠
سەرکوڵم ـ سوورترین شوێنی ڕوومەت ٠
سەرمایە ـ ئەو پارەیەی کە بە دەستەوەیە بۆ ئاڵوگۆڕ ٠
سەرمەست ـ سەرخۆش ٠
سەرمەشق ـ ڕاهێنان ٠
سەرمێز ـ پارچە قوماشێکە لەسەر مێز رادەخرێت ٠
سەرمۆر ـ ئەو شتەی سەرقاپەکەی نەکرابێتەوە ٠
سەرپەرشتکردن ـ واتاکەی دیارە ٠
سەرپەڕ ـ دواترین کەس لەو پەڕەوە ٠
سەرپەڕە ـ یەکەم نیشانەی شتێك ٠
سەرپەتی ـ سەرڕووت ٠
بەسەرپێوە ـ بە ڕاوەستانەوە ٠
سەرپێچ ـ خوارو نادروست ـ ئەو

شتەی سەری پێ دەپێچرێت ·

سەرپێچی ــ نادروستی ·

سەرپشك ــ هەڵبژاردنی شتێك بە ئارەزووی ئەو کەسە ·

سەرپۆش ــ واتاکەی روونە ·

سەرقاڵ ــ ناپەرژێت سەری بخورێنێ ·

سەرقەبران ــ واتاکەی روونە ·

سەرقووڵە ــ جۆرە ترێیەکی سوورو سپی مزرە لایەکی قوپاوە ·

سەرڕاست ــ واتاکەی دیارە ·

سەرڕاستی ــ ناوە بۆ سەرڕاست ·

سەرسام ــ سەرسوورمان ·

سەرسەری ــ واتاکەی روونە ·

سەرسمدان ــ هەڵنووتان ·

سەرسپی ــ پیاوی بەرێزو گەورە ·

سەرسووك ــ مرۆڤی بێ خەم ·

سەرشۆڕ ــ کزو خەمبار ·

سەرتەنوور ــ واتاکەی دیارە ·

سەرتەزێن ــ خواردنەوەی زۆر سارد

سەرتیپ ــ واتاکەی دیارە ·

سەرتوێژ ــ واتاکەی روونە ·

سەروبن ــ واتاکەی روونە ·

سەروچاو ــ ڕوو ·

سەرو گوێلاك ــ سەروڕوو ·

سەرومڕ ــ بەردەوام ( هەمیشە ) ·

سەروپێ ــ واتاکەی روونە ·

سەروسامان ــ سەروماڵ ·

سەروسوخت ــ شێوە ·

سەروشوێن ــ جێگا ·

سەروەر ــ گەورەپیاو ·

سەرخەو ــ واتاکەی روونە ·

سەرخۆش ــ سەرمەست ·

سەرخۆشی لێ کردن ــ دڵدانەوە ·

بەسەرزاری ــ لەدڵەوەنا ( هەر بە زمان ) ·

سەرزەنشت ــ ئامۆژگاری ·

**٢ ــ چـاو :**

چاوی مێزەکە ــ واتاکەی دیارە ·

بەسەرچاو ــ بۆ بەڵێن و جێ بەجێ کردنە ·

لەچاوت ــ لە خۆشەویستی یەکێك ·

چاوهەڵبڕین ــ خێسەکردن ·

چاوروونی ــ بۆ دڵخۆشیدانەوە ·

چاوچوونەخەو ــ خەولێکەوتن ·

چاوبەرایی نەهاتن ــ پێ ــ ناخۆشبوونی رووداوێك ·

چاوفڕین ــ بۆ روودانی شتێك لە پێشەوە دەوترێت ·

چاوگلۆفتن ــ واتاکەی روونە ·

چاوداگرتن ــ چاو هەڵتەكاندن ·

چاوداگیرسان ــ سـوور بوونەوەی چاو ·

ئاوی چاوداهاتن ــ نزیك بوونەوە لە كوێری ·

چاویاندەربێت ــ جۆرێكە لە جنێو ·

چاوپێكەوتن ــ سەرلێدان ·

لەچـاوی منت نەكەوێ ــ بەڵێنت دەدەمێ ( پشتم بەتۆ ئەستوورە ) ·

چاولێكردن ــ لاسایی كردنەوە ·

چاولێكەر ــ كەسێك چاو لـە یەكێكی‌تر بكات ·

چاولێكەریی ــ ناوی چاولێكردنە ·

بەچاوەوەبوو ــ یەكێك بـە سەركەوتن‌و خۆشی ئەم پێی ناخۆشە ·

چاوشۆڕكردن ــ واتاكەی روونە ·

چاوبزكردنەوە ــ تێنوارینی یەكێـك بەچاوكردنەوە ·

چاولێسوورکردنەوە ــ هەڕەشەكردن

چاولێكنان ــ مردن یا نووستن ·

چاولێپۆشین ــ گوێ‌نەدان لە یەكێك یا كارێك ــ لێ‌خۆش‌بوون ·

چاوڕشتن ــ جوان‌كردنی چاو بە كل یا بۆیە ·

چاوپێداخشاندن ــ خوێندنـەوەی شتێك بە پەلە ·

چاوباشقاڵ ــ مێ باز ·

چاوبەڵەك ــ چاو ڕەش ·

چاوبەخومار ــ خوێن‌گەرم‌و جوان ·

چاودێر ــ سەرپەرشتكەر ·

چاوەقووڵە ــ جۆرە نەخۆشی‌یەكە ·

چاوەڕوان ــ بە تەمای یەكێك یـا شتێك بوون ·

چاوەزار ــ نووشتەیە بـۆ دوورخستنەوەی شتی خراپ ·

چاوگ ــ سەرچاوە ·

چاویلكە ــ واتاكەی دیارە ·

چاوكراوە ــ یەكێكە دنیـادیدە بێت شەرم نەكات ·

چاوكونەسوژن ــ چاوی زۆر بچكۆلە بێت ·

چاومار ــ گورج‌و ئازاو زیرەك ·

چاوپیس ــ واتاكەی روونە ·

چاوسەوز ــ واتاكەی دیارە ·

چاوشین ــ واتاكەی دیارە ·

چاوزەردە ــ نەخۆشی‌یە ·

چاوچنۆك ــ برسی ·

**٣ ــ دڵ :**

لەبەردڵان ــ خۆشەویست ·

دڵبردن ( نەبردن ) ــ پێی‌دەخورێت

( یا ناخورێت ) •

بەدڵبوون ــ لەلای باشە •

دڵپێوەبوون ــ ئارەزووی لێ هەیە •

دڵخۆش ــ واتاکەی روونە •

دڵچوون ــ بووران‌ـــــــــــەوە ــ لەسەرخۆچوون •

دڵپێداچوون ــ دڵ پێوەبوون •

لەدڵدەرچوون ــ بیرچوونەوە •

دڵتێکچوون ــ نەخۆشبوون •

دڵپێدان ــ لەخۆشەویستیدا •

دڵدانەوە ــ دڵخۆشکردن •

دڵلێئێشان ــ تۆراندن •

دڵشکاندن ــ دڵ لێ ئێشان •

لەدڵگرتن ــ بیرنەچوونەوە •

دڵڕاگرتن ــ جوولانەوە ب‌ـــــــــە ئارەزووی یەکێك لە خۆشەویستیدا •

دڵدەرهاتن ــ بۆ ناخۆشیو شکستیيە

دڵنەهاتن ــ بەدڵی نییە یا لەب‌ـــەر پارە یا لەبەر هۆیەکی تر •

دڵداکەوتن ــ لە خورپەی ناخۆشیدا•

بەدڵەوەنووسان ــ بە ئارەزووی ئەو کەسە بووە •

دڵلێرەنجان ــ زیزبوون •

دڵسووتان ــ لە ناخۆشیو شکستیدا•

دڵداخورپان ــ دڵداکەوتن •

دڵدار ــ خۆشەویست

دڵداری ــ خۆشەویستی •

دڵلەرزێ ــ دڵەتەپێ ــ دڵ‌ـەکوتێ ــ واتاکەی روونە •

دڵنەرم ــ واتاکەی روونە •

دڵکراوە ــ دڵخۆش •

دڵکرمێ ــ دڵکرمۆڵ ــ دڵک‌ـرمن ــ

دوودڵ ــ یەکێ لە کارێ یا شتێ دڵنی‌ـــا نەبێت •

دڵپاك ــ واتاکەی روونە •

دڵپیس ــ شككردن لە هەم‌ـــــوو کارێکی یەکێکی تر

دڵرەق ــ پێچەوانەی دڵنەرم •

دڵسۆز ــ دڵپاك •

دڵشاد ــ دڵخۆش •

دڵتەنگ ــ خەمبار •

دڵتەڕ ــ ئەو پیرانەی کە دڵیانخۆشە

دڵودەروون ــ بیروباوەڕ •

دڵخواز ــ ئەوەی کە دڵ ئارەزووی بێت •

## ٤ ــ دەست ( دەس ) :

دەسوپێوەند ــ ئەندامانی سەر ب‌ـە خێزان

دەسڕۆیشتن ــ توانای هەی‌ـــە کار بکاتە سەر کەسانی تر •

دەس بەجێ ـ هەر لەو کاتەدا •

دەس خۆش ـ بۆ ئافەرین کردن •

دوودەس ـ دووجار •

دەس بۆبردن ـ واتاکەی روونە •

دەستبڕین ـ ساختەکردن لە یەکێك •

دەستبڕ ـ ساختەچی •

بەدەستەوەبوون ـ هەبوون •

لەدەستچوون ـ دۆڕاندن ، لەکیس چوون •

لەدەستدەرچوون ـ بزربوون ، نەمان •

دەستدان ـ دەستنەدان ـ دەگونجێت •

بەدەستەوەدان ـ شتێ یا یەکێ بدەی ( تەسلیم کردن )

دەستلێبەردان ـ وازیلێبێنیت •

دەست گەیشتن ـ ( دەستنەگەیشتن ) ـ کاتی نی‌یە ئەو ئیشە بکات •

دەستبەئاوگەیاندن ـ چوونە سەر ئاو •

دەستگرتن ـ یارمەتیدان •

دەستبەسەرداگرتن ـ ئاگاداربوونو بەخێوکردن •

دەستلێهەلگرتن ـ دەستلێبەردان •

دەستپێداگرتن ـ ئاگاداربوون لە شتێك ئابووریانە •

دەستپێوەگرتن ـ پاسەوانیکردنی کارێك •

دەستگوشین ـ واتاکەی دیارە •

لەدەستهاتن ـ توانای هەیە کارێ بکات •

دەستپێداهێنان ـ چاككردنی شتێك بۆ تازەکردنەوە •

دەستکەوتن ـ شتێك پەیداکردنو وەرگرتنی •

دەسکەوت ـ قازانج •

دەستلێکشانەوە ـ وازهێنان لە کارێك •

دەستپێکردن ـ واتاکەی روونە •

دەستتێکەلکردن ـ لەگەل ئافرەتێکدا رێككەوتن •

دەستپێکردنەوە ـ دووبارە دەستکردن بە کارێك •

دەستپێوەنان ـ قورتاربوون لە کەسێك •

دەستبەرووەوەنان ـ نەکردنی داخوازی‌یەك بۆ کەسێك •

دەستپەرژان ـ نەپەرژان ـ کاتنەبوون بۆ هەلسان بە کارێك •

دەستیشکاوم ـ بۆ ناخۆشی کەسێك دەوترێت ·

دەستلێشتن ـ بەتەمانەبوونی کارێك ·

دەستاودەستکردن ـ لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر ·

دەستبازی ـ یاریکردن بەدەست ·

دەست بە قلْپ ـ پارە یا شت خەرجکردن یا بەکارهێنان بە زۆری ·

دەستبەسەر ـ کەسێ بخرێتە ژێر دەستەلاتی دەولەتەوە نەتوانێ بەملاوبەولادا بڕوات ·

دەستخەرۆ ـ دەستبەتاڵ ( بێ ئیش ) پەیمانی درۆ ·

دەستبڵاو ـ شتبڵاوبکاتەوە بێ ئەندازە ·

دەستبزێو ـ بزێوە ، ناسرەوێت ·

دەستدار ـ بەتوانا ·

دەستدرێژ ـ بێحەیا ·

دەستدرێژی ـ ناوە بۆ دەستدرێژ ·

دەستەلات ـ توانا ـ هێز ·

دەستەمۆ ـ گیاندارێکی ماڵی ·

دەستەپاچە ـ بێدەستەلات ·

دەستەوارە ـ ئەو خواردنەی لەگەڵ کەسێکدا بە دەست یا لە پشت هەڵدەگیرێت ·

دەستدە ـ یارمەتی ( خێر )کردن ·

دەستی ـ پارەیەك کە بە قەرز بدرێت ·

دەسکەگوڵ ـ واتاکەی روونە ·

دەسکەوان ـ ناوی ئامێرێکی ناوماڵە بۆ شت کوتان بەکاردێت ·

دەسك ـ شوێنی گرتن بە دەست ·

دەسکێش ـ واتاکەی روونە ·

دەسکرد ـ شتێ کە مرۆڤ کردبێتی نەك سروشت ·

دەستکورت ـ یەکێ کە دەستی نەڕوات یا پارەی نەبێت ·

دەسماڵ ـ دەستەسڕێکی گەورەو پان ·

دەستتێژ ـ تێژراوە بە تایبەتی ·

دەستنیشانکردن ـ دیارکردنی شتێك لەناو کۆمەڵێکدا ·

دەستنوێژ ـ پاککردنەوەی دەستو دەمو چاوو قاچو ئامادەکردن بۆ نوێژکردن ·

دەستنووس ـ پەڕەی بەدەست نووسراو ·

دەستپاك ـ کەسێکی دەروونپاك ·

دەستپیس ـ کەسێکی دەروونپیس ·

دەسترۆکە ـ جۆرێکە لە دەستەسر یا دەستماڵ ·

دەستڕاست ـ نیشانڕاست •

دەستڕێژ ـ تەقەیەکی زۆر •

دەستوبرد ـ خێرا کردن •

دەستە ـ تاقم ، کۆمەڵ •

دەستەجل ـ قات ( چاکەتو پانتۆڵ ) •

دەستە دەستە ـ کۆمەڵ کۆمەڵ •

دەستەبرا ـ کۆمەڵێ کوڕان لە یەک تەمەندا •

دەستەخوشک ـ کۆمەڵێ کچان لە یەک تەمەندا •

**٥ ـ پشت :**

پشتیچاو ـ واتاکەی دیارە •

پشتیسەر ـ دوواوەی سەر •

پشتیتیغ ـ سەرە کولەکەی چەقۆ •

پشتپێبەستن ـ باوەڕبوون بە یەکێک بۆ کارێك •

پشتساردبوونەوە ـ نەکردنو وازهێنان لە کارێك •

پشتگرتن ـ یارمەتیدان •

پشتهەڵکردنلە ـ باوەڕنەبوون بە یەکێک ـ پشتپێنەبەستن •

خستنەسەرپشت ـ واتاکەی روونە ـ دەرگاکردنەوە •

پشتاوپشت ـ لەباوباپیرەوە بۆ وەچەکان •

پشتەمەلە ـ واتاکەی روونە •

پشتەمەر ـ جۆرێکە لە زێڕ پۆشی بۆ ژنان •

پشتئەستوور ـ دڵنیابوون لە کارێك •

لەپشتەوە ـ لەدوواوە •

پشتێن ـ واتاکەی روونە •

پشتی ـ واتاکەی روونە •

پشتیوان ـ یارمەتیدەر •

**٦ ـ پێ :**

پێژیو ـ ئەو خواردنەی پێیدەژین •

لەپێناویدا ـ لەبەرئەو ، بۆ ئەو •

پێنووس ـ خامە •

پێویست ـ واتاکەی دیارە •

پێخەف ـ نوێن •

بەپێی ـ بە چۆنێتی ( بۆ پلە بەکاردێت •

بەمپێیە ـ بەم جۆرە •

لەسەرپێ ـ ئامادەیە بۆ تەقاندن ( تفەنگ ، دەمانجە ، تۆپ ) •

پێگرتن ـ دەستکردن بە ڕۆیشتن ( منداڵ ) •

لەپێکەوتن ـ نەتوانینی ڕۆیشتن •

لەپێکردن ـ واتاکەی روونە •

پێلێنان ـ دانپیانان •

بەپێوە ـ واتاکەی روونە •

پێڵاو ـ واتاکەی روونە •

پێ‌پەتی ـ پێ‌خاوس ·

چاوپێداخشاندن ـ سەیرکردنی شتێك بەپەلە ·

پێ‌خوێندن ـ بەزۆرخوێندن ·

چیت‌پێ‌برا ـ چ کەلکێکت وەرگرت ·

پێ‌بوون ـ بەڕۆژوو بوون ·

پێم‌نی‌یە ـ لام‌نی‌یە ·

چارەکێکی پێ‌چوو ـ بۆکات ·

پێ‌گەیشت ـ گەورەبوو ·

پێ‌ی‌گەیشت ـ تووشی‌بوو ـ وەری‌گرت ·

پێ‌گەیاندن ـ گەورەکردن ·

پێکەنین ـ واتاکەی روونە ·

پێ‌کەوتن ـ باشە بۆ ئەو کەسە ( دەرمانەکەی پێ‌کەوت ) ·

چاوپێکەوتن ـ بینین ·

پێ‌کردن ـ ئەم پێڵاوە بەپێم ناکات ·

پێ‌نەکردن ـ ئەم کارەم پێ‌ناکرێ ـ ناتوانم جێ‌بەجێ‌ی‌بکەم ·

پێ‌ناسین ـ یەکێك بە یەکێکی تر بناسێنێ ·

پێ‌وێران ـ پێ‌ی ناوێرێ ـ دەترسێت ·

۷ ـ دەم :

دەم ـ دەمی چەقۆکە ـ لاتیژەکەی ·

دەم‌خۆش ـ بۆ دڵخۆش‌کردن ـ ئافرین‌کردن ·

دەم‌بوون بە تەڵەی‌تەقیو ـ نەتوانی هیچ بڵێیت ·

بەدەمەوەدان ـ رێگادان بە کارێك ·

دانەدەم ـ پارچە قوماشێك بخرێتە سەر پارچەیەکی تر بۆ درێژی ·

دەم‌دروون ـ بێ وورتە ·

دەمەتەقێ ـ قسەوباس ·

دەماودەم ـ دووبارەکردنەوە پاش‌ماوەیەك ·

دەم‌درێژ ـ زۆر بڵێ ·

دەمەوئێوارێ ـ نزیك ئێوارێ ·

دەمەوانە ـ شتێکە وەك سەرقاپ ·

دەمەوەر ـ زۆربڵێ ·

دەمەزەرد ـ تیژکردنەوە ـ تازەکردنەوە ·

دەم‌هەراش ـ دەم‌درێژ ·

دەم‌شڕ ـ دەم‌هەراش ·

دەم‌ودەس ـ دەست‌بەجێ ·

دەم‌وفلق ـ دەم‌و فلچ ـ دەم‌ولەوس ـ پروپووچ ·

دەم‌شڕ ـ دەم‌هەراش ·

دەمڕاست ـ نوێنەرێکی قسەزانی کۆمەڵێك ، سەرۆکی لیژنەیەك ·

# دوازانیاری دەربارەی :
# ئەستێرەی مشتەری و ئەستێرەی زوحەل

دەستکەوتێکی مەزنی سەدەی بیستەم ئەوەیە کە زاناکان رووبەڕوویان کردوەتە دۆزینەوەی نهێنییەکانی بۆشایی گەردوون ، بنکەکانی لێکۆڵینەوەی بۆشایی لەم چەند ساڵەی رابردوودا کۆمەڵێك مانگی دەستکردو کەشتیو ئیستگەی بۆشاییان ناردە لای ئەستێرە گەڕۆکەکانی ئەندامی کۆمەڵگای هەتاو · جا ئەو بەرجەستە ئاسمانییە دەستکردانەی زاناکان ناویان ناوون ( مرۆڤی مەکینە ) توانیویانە بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ژمارەیەك وێنەی فوتوغرافیی مەریخو زوهرەو عەطارید لە زۆر نزیکەوە بگرنو ڕەوانەی بکەن ·

ئەم ساڵ قۆناغێکی تازە لە قۆناغەکانی ڕێگای دۆزینەوەی شوێنە نەزانراوەکانی دەوری دنیای مشتەریو زوحەل دەستی پێکرد · لە بەهاری ئەم ساڵدا کەشتیی بۆشایی ( فویاجیری یەکەم ) لە ئەستێرەی مشتەری تێپەڕی کرد · لە تەمووزی رابردووشدا فویاجیری دووەم لەناو لێکۆڵەرەوەکاندا هەرایەکی زانستانەی گەورەی بەرپاکرد دوای ئەوەی کە ئێجگار لە نزیك مشتەرییەوە گوزەری کرد · لە ١ی/ئەیلولی ١٩٧٩شدا کەشتیی ئاسمانی ( بایونیر ١١ ) بە ناو ئاڵقەکانی زوحەلدا تێپەڕ بوو ·

وا هەوڵدەدەین تیشکێك بخەینە سەر هەندێ زانیاریی نوێ کە بە هۆی کەشتییە ئاسمانییەکانەوە بە زانایانی بۆشایی گەیشتووە ·

### فویا جیر ١

لە ئاداری رابردوودا کەشتیی ئاسمانی فویاجیری یەکەم گەیشتە دنیای سەیروسەمەری یەکێك لە ئەستێرە هەرە گەورەکانی کۆمەڵگای هەتاو کە مشتەرییەو تیرەکەی ١١ ئەوەندەی تیرەی زەوییەو نزیکەی ٩٣٠ ملیۆن کیلۆمەتر مان لێدووره · وە بۆ یەکەم جار لەسەر پەردەی تەلەفزیون زاناکان دیمەنی تەواوی جووڵانەوەی ئەو سروشتە مەزنە-یان دیت کە لە چوارچێوەی

ئاسمانێکی پڕ لە تەمومژی رەنگ سوورو نارنجی‌و زەردو شینی دەوری ئەستێرەکـە دابوو • جـاران وا دەزانرا کـە ئەم ئەستێرەیە هەمیشە تەمومژێکی چڕی لـە دەورە ــ زاناکان بۆیان‌دەرکەوت کـە ــ ئـەم ئاسمانە تەماوی‌یە بریتی‌یە لـە تێکەڵەیەکی غازی هیدرۆجین‌و هلیۆم‌و ئەمۆنیاك ، تێکەڵەیەك لەو تەمانەی کەوا گێژەنەو گەردەلوول دەیان‌هێنێ‌و دەیان‌باو بەردەوام بروسکەیان لـەناودا هـەڵ دەبێت •

**بەڕاستی ئەم گەشتی‌یە زاناکـانی سەرسامکرد ، چونـکە زۆر شتی وای روون‌کردەوە کـە هیچیان لێ‌نەدەزانی ، لەوانە ئەمـەی دەرخست کـە مشتەریش وەکو زوحـەل خەرمانەیەکی بازنەیی رەنگ‌کاڵی لـە دەورە کە ئەستووریی لـە ٣٠ کیلۆمەتر زیاتر نی‌یەو درێژیی چێوەکەی نزیکەی ٨٠٠٠ کیلۆمەترەو لـە پارچۆلکەی بەردی گەردوونی پێك‌هاتووە•**

هەروەها بۆ یەکـەم جاریش لە مێژووی بۆشایی‌یەوانی‌دا ئەم گەشتی‌یە چـەند وێنـەیەکی گـەورەکراوی فۆتۆغرافی ئێجگار ئاشکرای چوار مانگی گەورە لـە مانـگەکانی دەوری مشتەری ناردە زەوی کـە ئەمـانەن : ایو IO ، یوروپا Europa ، گانیمیـد Ganymed و کالیستو Kalisto کە ساڵی ١٦١٠ غالیلۆ غالیلای دۆزی‌یەوە • شـایانی باسیشە کـە مشتەری ١٣ مانگی لـە دەورە کـەوا بەگشتیان کۆمەڵـگایەکی ئەستێرەیی سەربەخـۆ پێـك‌دەهێنن‌و ناوەندەکەیان مشتەری‌یە •

لـەم وێنانەدا دیاربووە کە قەبارەی مانگی ئەیو لە قەبارەی مانـگی زەویمان نزیـکە • ئـەوەی زۆر زاناکـانی سەرسام‌کردووە ئەوەیە کە ٧ بورکـانی لەسەرە کـە ئێجگار بە تەووژم ئاگراوی دەروونیـان هەڵدەدەن بە خێرایی‌یەك نزیـکی ٣٦٠٠کم لـە سەعـاتێك‌دا تەقدیردەکرێت • زاناکان لایان‌وایە کە ئەم تەقینەوە بورکانییانە کـار لە تێکڕا کۆمەڵگای مشتەری دەکەن •

ئەم زانیارییە تازانە وایان لە زاناکان کرد کـە دەستبەجێ بەرنامەی ڕێڕەوی فویاجیری دووەم بگۆڕن ، ئەگـەرچی ئەمەی دووەم بە ١٦ رۆژ پێش یەکەمەکـە بەرەڵلای ئاسمان کرابوو بەڵام پاش ئـەم گۆڕینە ڕێگەی گەشتەکەی لە جـاران

درێژتر بووەوەو بڕیاردرا کە تادەتوانێ زۆرتر لەو چوار مانگە نزیك بکەوێتەوە .

**فویا جیری ۲**

ئەم دوو کەشتی‌یە ئەزموونکەرانە گەلێ ئامرازی وێنەگرتنی تەلەفزیۆنی‌و ئەرێلەکانیان و دەزگای پێوانەی زۆر هەستدارو کۆمپیۆتەری بچووك‌کراوەیان هەڵگرتبوو لە تەمووزی رابردوو فویاجیری دووەم هەندێ وێنەی دنیای مشتەری ناردو ماوەی وێنە ناردن لە مشتەری‌یەوە بۆ ئیستگەکانی سەرزەوی لە ناوچەی باسادینادا یەك سەعاتی تەواوی خایاند . ئەگەرچی کەشتی‌یەکە تووشی لێشاوێکی گەورەی تیشکە مەترسیدارەکانیش بوو ، بەڵام هەروەکو بۆی داندرابوو کاری خۆی بە بێ‌وەستان ڕاپەڕاند ، ئەو زانیاری‌یە تۆبۆغرافیانەی زاناکان لەسەر پەردەی تەلەفزیونەکانیان بەرچاویان کەوت کە ئەم کەشتیانە ناردبوویان واق ورمان و شڵەژانو داماویی خستە دەروونیانەوە ، بەتایبەتی دیمەنی هەمەرەنگی مانگی کالیستو یان دیمەنی سروشتی رووبەری مانگی یوروپای پڕ لە قەڵشتو درزو بەزۆری ڕەنگ زەرد کە دەتگوت تۆکڵە هێلکەی شکاوە . بۆیەش ئەم زانیاریانە زاناکانیان شڵەژاند چونکە تا ئێستا نەیانتوانیوە لەڕووی زانستی‌یەوە هۆیەکانیان بدۆزنەوە . سەرباری ئەمەش ئەو خەرمانە بازنەیی‌یەی دەوری مشتەری کە بە هۆی تیشکی خۆرەوە ئێجگار روونالکو بەشەوق دیاردەکەوت هەرگیز لە خەیاڵی کەسیاندا نەبوو . چۆن ئەم خەرمانەیە دروستبووە ؟ لەچی پێك‌هاتووە ؟ ئا ئەم پرسیارانە لە دنیای بۆشایی‌یەوانی‌دا وەك مەتەڵێکن‌و کەس هەڵی‌نەهێناون . ئەم زانیاری‌یە تازانە کارێکی وایان‌کرد کە هەرچی شتێك دەربارەی بنەڕەت‌و پێگەیشتن‌و سروشتی کۆمەڵگای هەتاو بەڕاست دەزانرا بخرێتە ناو قەفەزی گومانلێکردنەوە .. هەر بۆیەش دکتور لورنس زوردر بلومی جیولوجی لەم‌بارەوە دەڵێ « جاران لامانوابوو لەبابەت ئەستێرانەوە زانیاریی لە راستی‌یەوە نزیکی بە نرخمان هەیە ، کەچی ئێستا دەرکەوت ، کە تابلێی لەم بۆچوونەدا دەستخەڕۆ بووین » .

**پێش‌بینی**

**ئێستا کەشتی‌ی فویاجیری یەکەم وا**

بەرێوەیە بگاتە زوحەل ، کە وەکو دانراوە پێویستە لە ئابی ١٩٨١و لە کانوونی‌دووەمی ١٩٨٦دا بەلایدا تێپەڕێت · وە ئەگەر هیچ تەگەرەیەکی نەیەتە پێش ئەوا ساڵی ١٩٨٩ بەلای ( نبتون )یشدا ڕەتدەبێ · زانایان وا چاوەڕوان دەکەن کە ئەم دوو کەشتی‌ی بۆشایی‌یە لەو چەند ساڵەی داهاتوودا گەلێ دۆزینەوەی نوێ لە دنیای بۆشاییدا بخەنەڕوو · جارێ کەشتی‌ی فویاجیری یەکەم کە تا ئێستا ماوەیەکی وای بڕیوە کەوا زیاد لە ٨٠ ملیۆن کیلۆمەتر لە (مشتەری) دوورتر چووە بەر لە ماوەیەکی کەم هەندێ زانیاریی تازەی دەربارەی ناوچەیەکی ئێجگار گەرم ناردووە کە کەوتوەتە نێوان مشتەری‌و مەریخ‌و تا ئێستاش کەس پێی‌نەدەزانی ، گەرماییەکەشی چەندجار لە گەرمای سەر کوورەی هەتاو زیاترە · ئەمە هەرچونێك بێ ، زاناکان هەمیشە چاوەڕوانی زانیاریی لەناکاوی زۆرترن دەربارەی بۆشایی‌ی گەردوون ·

**زوحەل ئەلیادەی بۆشایی‌یە**

ئەو چەندە زانیاری‌یەی گەشتەکانی ئەم (٢٢) ساڵەی دوایی‌یە دەربارەی کۆمەڵگای هەتاو دەستیان خستووین لەو هەموو زانیاری‌یە زۆرترە کەوا لە ٥٠٠٠ ساڵی بەری هاتوەتە سەر ( گەردوون‌زانی ) ، ئەوەیش کە یەکەم جار وای‌بۆچوو کە زوحەل چەند مانگێکی خۆی هەیە غالیلۆ بوو · ساڵی ١٦٥٦یش هایکنزی فیزیازانی هۆڵەندی ئەڵقەیەکی دۆزی‌یەوە کە وەکو خەرمانەیەکی نادیار دەوری ئەستێرەکەی داوە · دوای ئەو زاناکان ٥ ئەڵقەو ١٠ مانگی دی ئەم ئەستێرە مەزنەیان دۆزی‌یەوە کە گەورەترینیان مانگی ( تیتان ) بوو ئەمەش دوای ئەوەی کە دووربین‌و دەزگاکانی تێڕوانینیان چاکترو پێش‌تر خست ·

هەروەکو لە پێشەوەی ئەم ووتارەدا باسمانکرد ، ساڵی ئەم ساڵ دەربارەی دەستکەوتنی زانیاری‌و ئاشکراکردنی نهێنی‌یەکانی مشتەری‌و زوحەل ساڵێکی بەناوبانگ بوو ، دووا هەواڵ ئەوەبوو کە کەشتی‌ی بۆشایی « بایونیر ١١ » لە یەکی ئەیلولی ١٩٧٩دا ناردی لەگەڵ چەند وێنەیەکی فۆتۆغرافی رەنگاوەرنگی دنیای ئەستێرەی زوحەل‌و ئەندامەکانی ·

ئەو زانیاری‌یە تازانەی بایۆنیری ١١ هـــەرگیز لـــە فیـــکری بریـــکاریی لێکۆڵینەوەکانی بۆشـــایی (ناســـــا)ی کالیفورنیادا نەبوو . هەر ئەم کـەشتی‌یە یەکـەم رابەرێك بوو کـە توانی خەرمانە نەزانراوەکەی دەوری ئـــەو ئەستێرەیە ببڕێت ، هەروەها گەلێ نهێنی‌و لێکدانەوە کـــە ماوەیەکی دووردورێژ زاناکانیان خەریك‌کردبوو ئەم هەمووی ساغ‌کردەوە ، هەروەکو زانراویشە لـــە ٦ی نیسانی ١٩٧٣دا بوو هەڵدراو لـە یەکی ئەیلولی رابردوودا گەیشتە ئامانجی خۆی کـــە زوحەل بوو ، ئیتر دەستی‌کرد بە هەناردنی زانیاری‌یە گرنگەکان‌و ڕاست‌کردنەوەی بۆچوونە هەڵەکانی پێشوو ، بەر لەهەموو شتێك کـەوا زوحەل لە گەورەییدا دووەم ئەستێرەی زەوی‌یەو شەش ئالقەی لەدەورە ( لەباتی پێنج )و ١١ مانـــگی هـــەیە ( لەجیاتی ١٠ ) . بەلام ئایا ئەم ئالقانە چۆن‌و کەی پەیدابوون تائێستا زاناکانی گەردوون‌ناسی ئەم مەتەڵەیان هەڵنەهێناوە دەڵێن لەوانەیەو زۆرنزیکە کە ئەم ئالقـە زراوانە کـــە لـــە زۆر بڕکــــەیاندا تیشك‌ئاوێژن بریتی‌بن لـــە پاشماوەی پەردی مەییوی نەیزەکی ، تێڕوانینێکی تریش هەیە لای‌وایە کـــە ئـەم ئالقانە پاشماوەی ئەو تۆپەڵە تەمومژانەن کـــە لەبەرەوە ڕەق‌بوون‌و دیمــــەنی خڕی زوحەلیان پێك‌هێناوە . بـــەلام ئـــەو تیوورییی‌یەی کـــە جاران باو بوو وای دەردەبڕی کـــە ئەم ئالقانە لە پاشماوەو پەردووی ئەستێرەیەك پێك‌هاتوون کـــە وەختی خۆی لە زوحەل کەوتووە .

گەشتی بایۆنێری ١١ پڕ لـــە مەترسی بوو و دەتوانین بە داستانی ئۆدیســـەی هۆمیرۆسی بچوێنین ، ئەوەبوو زاناکان بە دڵەلەرزەوە چاوەڕوانی ئەنجـــامی ئەوەبوون کـــە لـــە یەکی ئەیلولی رابردوودا لە زوحەل بکەوێت‌و تێك‌بشکێ کاتێك کە بەخێرایی ١٠٠ هەزار کیلومەتر لـــە سەعاتێـکدا پشتێنە ئالقەیی‌یەکەی دەوری بڕی . یەکـــەم مەترسی کـــە بەسەریدا زاڵ‌بوو ئەوەبوو پشتێنەیەکی گەورەی وای بڕی کە لە هەزاران هەزار وورده ئەستێرەی گەڕۆکی نێوان مەریخ‌و مشتەری پێك‌هاتووە . لەکانونی‌یەکەمی ١٩٧٤دا کەشتی‌یە بۆشایی‌یەکە کـەوتە ژێر کارتێکردنی ڕاکێشانی مشتەری‌یەوە ( کـــە نزیکەی ٣١٨ جار لـــە زەوی گەورەترە )و شا ئەندامی کۆمەڵگای رۆژە

ئەوســـا زاناکان ناچاربوون ڕێڕەوی کەشتی‌یەکە بگۆڕن‌و خێرایی‌یەکەی تـــا ئەوپەڕی توانا بەرزبکەنەوە کـــە هیچ کەشتی‌یەکی بۆشایی تر ئەوەندە خێـــرا نەڕۆییبووە ، بۆئەوەی لەو ڕاکێشـــانە ڕزگاری بکەن ئیتر خولێك بــــە دەوری مشتەری‌دا سووڕایەوەو پاشان سەرلەنوێ کەوتەوە بۆشایی‌یەکەی گەردوون ٠

بایونیری ١١ نزیکەی ٤ر٢ ملیـــارد کیلۆمەتری بڕی تاتوانی لـــە نزیکی ٣٠ هـــەزار کیلۆمەترەوە ( ٥٠ ) وێنـــــەی فۆتۆغرافی ڕەنگاورەنگی زوحەل بگرێتو بینێرێتە زەوی ٠ ٠ کـــە دەڵێی گۆیەکی ئێجگار مەزنی ئاو ئۆقیانووسێکی زلـــە ، بۆیەش وایە چونکە دووبەشی لـــە سێ بەشان لە غازێکی سووك پێك‌هاتووە کـــە هیدرۆجینە ٠ ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە زوحەل چەند گەرمایی لـــە گوڕی هەتاو وەردەگرێت دوو ئەوەندەش گوڕی گەرما دەردەدات لەوانەشە ئەم زیادەیە لـــــە ئەنجامی کەڵەکەبوونی پاشماوەکانی ئەو گوڕە بێت کـــە لەســـەرەتای قۆناغی پەیدابوونی‌دا لە ماوەی هەزاران ساڵدا لە غازو خۆڵە گەردوونی‌یەکانەوە دەرچوون٠ لـــە ڕووی زانستیشەوە وەکو دەزانرێ

ئەگـــەر تۆپەڵی گەورەی هەورە غازی هیـــدرۆجین لەیەك‌بـــکەون ئەوسـا ئەتۆمەکانی ئەم غازە شی‌دەبنەوەو ئەمەش دەبێتـــــە مـــــایەی توانەوەی ناووکی ئەتۆمەکانی ئەم غازە ، ئەم توانەوە یان کەرتبوونە ئەتۆمی‌یەش سەرچاوەی گوڕو ووزەیە هەروەکو لـــە گوڕی هەتاویش بەدی‌دەکرێت ٠

وێنە فۆتۆغرافی‌یە ڕەنگاورەنگەکان بـــە کامێرای خۆمانە نەگیراون ، بەڵـــکو بەهۆی دەزگا ئەلیکترۆنی‌یەکانی هێزی ڕووناکی-پێو/گیراون کە شوێن ڕووناکی‌ی ســـەر ڕووی زوحـــەل خاڵ بــــە خـــاڵ هەست پێ‌دەکەن‌و پاشان بۆ چەند پلەیەك دەسکەنەیان دەکەن کـــە لە پلەی هیچەوە تا ٦٣ پلەن ڕەنگی سوور لەپێشەوەو ئنجا ڕەنگی شین بەدوای ئەودا دێ ، پاشـــان بۆ زەوی دەنێردرێن بە هۆی دەزگـــای ناردنەوەو لـــە مـــاوەی یەك سەعات‌و نیودا دەگەنە ئیستگەکانی وەرگری ســـەر زەوی ٠ ئیستگە وەرگرەکانی وولاتـــە یەکگرتووەکان‌و ئوسترالیاو ئسپانیا کـــە ئەم زانیاری‌یانە وەردەگرن دەیدەن بـــە کۆمپیوتەرێك کـــاری ئەوەیە نرخـــە ڕووناکی‌یە سەوزەکان لە سوورو شینەکان

حیساب بکات ، پاشان سەرجەمی ئـــەم نرخانە بە شێوەی وێنەی رەنـــگاورەنگی تەواو بباتە سەر پەردەی (فیـــدیۆ)و دەستبەجێ وێنە بگیرێن .

**هێشتا بایونیری ١١ وەلامی ئـــەو پرسیارەی نەداوەتەوە کـــە دەمێکە زانایانی خەریك کردووە : ئایا تۆ بلێی هیـــچ جۆرە ژیانێك لەســـەر تیتانی گەورەترین مانگی زەوحـــەل نەبێت ؟**

چونکە ئەم مانگە لە ناو کۆمەلگای هەتاودا تاکـە کـە هەورو پێکهاتووەکانی دووەم ئۆکسیدی کاربونو هیدرۆجینی لە بەرگە ئاسمانەکەیدا هەبن کە ئەمانەش بنەمـا گرنگەکانی ژیانن . زانایان وای بۆ دەچن کە (جەو)ی سەر ئەو مانـــگە زۆر ساردە ـ چونــکە هێجگار لە هەتاوەوە دوورە ـ بەرزترین پلەی گەرمای چاوەروانکراو رەنگە (هیچی) سەدیی بێت بەلام ئـەوەی زاناکـــانی هەلغراندووەو مـــایەی سەرنجراکیشـــانە ئەوەیە کاتێك کـــە بایونیری ١١ بەلای تیتـــاندا رەتبوو ، دەربارەی گەرمای جەووەکەی زانیاریی دەگەیاند ، لەم کاتەدا پەرتکردنەکـــەی ئالۆز بوو ئەمەش بووە هۆی لەناوچوونی چەند زانیارییەکی گرنگ .

ئەوساش بریکاریی[١] (ناسا) هەوالی دا کە ئەم ئالۆزییە ئەنجامی هـــەندێ تەقینەوەی هەتاویی بووە کـــە بووەتە مایەی لەناوچوونی ئـــەم زانیارییانە . بەلام هەندێ زانا وای بۆدەچن کە لەوانەیە «زیندووە»انی ناو تیتان ئەم ئالوزییەیان پەیداکردبێت .

ئیتر وا چاوەروان دەکرێت کە کەشتی بۆشایی فویاجیری (١) گەلێ نهێنیی تری ئەم مانگە ئاشکرا بکات کاتێ کـــە لـــە تشرینی دووەمی ســـالی هـــاتودا بـــە زوحەلدا تێپەر دەبێت .

**لە گۆڤاری ( آفاق عربیـــە)وە**
**ژمارە ٣ـ١٩٧٩**
**ع.ب کردوویە بەکوردی**

(١) بریکاریی : وکالە .

چیرۆك

# ئەفسیانەی کورسیی حەیزەران

نووسەری ئەڵمانی : هێرمن هێسە

لاوەکە لـــــە ژوورە لاچەپـــە بنمیچی‌یەکەی سەرەوە تاك‌و تەنیـــــا لێی‌دانیشت · دەیویست ببێ بە وێنەکێش بەڵام چەند کۆسپێکی لەبەردەم دابـــوو دەبوو پێش هەموو شتێك لێیان دەربـاز بێت · بەڵێ لــــەو ژوورە بنمیچی‌یەدا ژیانێکی هێمنـــــانەی بەسەردەبرد · وا ماوەیەکی کەمی بەسەردا تێپەڕیوەو لەوە ڕاهاتووە کە بۆ چەند سەعاتێك لەبەردەم ئاوێنەیـــــەکی بچووکدا دابنیشـێت ، هەوڵبدا وێنەی خـــۆی بکێشێت · وا دەفتەرێکی تەواوی بەم جۆرە وێنانـــــە پڕکردوەتـــەوە ، هەندێکیان زۆر باش دڵیان بە هێز دەکردو بەخۆی دەگوت ·

**« هەر چاکە ، خۆ جاران نەمدەزانی وێنەکێشان چی‌یە ·· ئیتر ئەو وێنەیـــە زۆر باشە ·· ئەی ئەو لۆچە جوانەی لای بناگوێم · زۆر ئاشکرایە ·· من لە خاوەن بیرەکانم ·· یان شتێکی لەو بابەتەم ·**

جارێکی تریش لە وێنەکە ڕادەمـــاو دەیگوت :

**« پێویست بەوە ناکا گۆشـەی دەم کـەمێك بەرموخوار ببـــەم · بێ‌گومان هەستێکی تایبەتی دەبەخشێ ، غەمگین ، زۆرغەمگین » ·**

بەڵام پاش ئاویك کە جارێکی تـر سەیری وێنەکانی دەستکردی خـــــۆی دەکردەوە هیچیانی بەدڵ نەدەبـــوو ··· تووڕە دەبوو ·· هەڵدەچوو ·· بـــەڵام بەوە فێڵی لەخۆی دەکرد کە گوایا ئەمـە مانای وایە لــە کارەکەیدا پێشکەوتووەو پێویستە هەمیشە خۆی هەڵپێچێ زیاتــر بەرهەم پێشکەش‌بکات ·

ئەم لاوە لەگەڵ ژوورە بنمیچی‌یەکەی‌و کەلوپەلو شتە ڕێك‌خراو یان ڕیزکراوو یان پەرش‌وبڵاوەکانیدا دۆستـایەتی‌یەکی گەرمی نەبوو · بەڵام خراپیش نەبوو ·· واش نەبوو وەکو خەڵکی تر کە دەیکەن کەم‌و زۆر زۆردارانە سەیریان بکات ، چونکە وەکو بڵێی هــــەر ناشیان‌بینێ ، مەگەر چۆن دەنا هەر پێشیان نازانێ ·

کـــاتێ کـــە دەیبینی وێنـــە دەستکردەکەی خۆی سەرکەوتوو نی‌یـە جـاروبار خۆی بە کتێبیکەوە دەخافڵاند ،

کتێبێك لەو کتێبانەی لێیانەوە تێگەیشتووە کە لاوانی تریش کە دەستیان بە کارکردووە کەس نەیناسیون وپاشان بوون بە گەورە پیاوو مەزنی بەناوودەنگ • جا ئەم جۆرە کتێبانەی بەتاسەوەو پڕ بەدڵ دەخوێندەوە • دوارۆژی خۆی تێدا سەیردەکردن • ڕۆژێك کە وەڕز بوو • بێزاربوو ، دڵی دەگوشرا دەستی بۆ کتێبێك لەو کتێبانە درێژکرد شتێکی لەبارەی وێنەگرێکی هۆڵەندی زۆر بەناوبانگ خوێندەوەو نووسرابوو ئەم وێنەگرە شەیدای بیری وێنەکێشان بوو ، تا ئەو شەیدابوونەی لێبوو بە چەشنە سەوداو شێتییەك • دەیویست ببێتە وێنەکێشێکی باش ، بوویێ • لاوەکە بینی کەوا هەندێ شتی لەو هونەرمەندە دەچێت ، پاشئەوەی دووبارەو سێبارەو چەندجارێك خوێندنیەوە وای بۆ دەرکەوت کە هەندێ شت لە هونەرمەندەکەدا هەیە بەتەواوی لەودا نییە ، بەنموونە هونەرمەندە هۆڵەندییەکە ئەگەر ئاسمان تەڕوتوش بووایەو نەیتوانیبا کاربکات لە ژوورەکەی خۆی دەرنەدەچوو •

بەڵکو لە ژوورەوە ئێجگار بە ئارەزوو و بێپچڕانەوە هەرچی بەرچاوی کەوتبا وێنەیدەکێشا ، کام شت زۆر ووردو سادەش بووایە لە دەست فڵچەکەی ئەو ڕزگاری نەدەبوو ،بەنموونە جووتە قاپقاپێك ، جارێکیشیان کورسییەکی کۆنی گێڕو شەلی وا کە کەس مەرحەبای لێنەدەکرد ، تابلۆیەك لە تابلۆ ڕەنگینەکانی کورسییەکی چێشتخانەی لادێیانەی ناقولاّبوو کە لە دارێکی بێبایەخ دروستکرابوو پووشی جێدانیشتنەکەی بوو بوو بە کاووکۆت ، بەلاّم وێنەکێشە هۆڵەندییەکە بە کامی دڵو وەفاداریو دڵسۆزییەوە وێنەیکێشا ، ئیتر بە هۆی سەرگەرمی ئارەزوومەندیی خۆیەوە کورسییە کۆنە تێكشکاوەکەی کرد بە تابلۆیەکی لە جوانترین وێنەکانیو نووسەری کتێبەکەش گەلێ ووشەی جوانجوانو بەکاری لە وەسفکردنی کورسییە پووشینە وێنەکێشراوەکەدا خەرجکردبوو •

لێرەدا لاوەکە تاوێ لە خوێندنەوە وەستا ، ئەو شتەی دەبێ ئەمجارە تاقیبکاتەوە شتێکی نوێیە • بۆیە کتوپڕ

بڕیاریدا ـ خۆیشی لاوێکه هەموو بڕیارەکانی ئیجگار کتوپڕە ـ ئەویش چاو لەو مامۆستا گەورەیەی خۆیبکات و بەرەو گەورەیی ئەم ڕێگەیە بگرێت ٠

چاوێکی بە ژوورە بنمیچییەکەی خۆیدا گێڕا هەروەکو ئەو شتانەی کە تێیدایە لەمەوپێش بە چاکی نەدیتبن ٠ جارێکی تریش چاوی پێداگێڕا ٠ ٠ هەرچەند ڕوانی نە کورسییەکی داری شلەقاوی جێدانیشتن لەپووش چنراوو نە جووتە قاپقاپەیەکی داری نەدی ٠ غەمدایگرتو نەترەی بەردا ، لەوانەبوو ئەو بێهیواییە دایبگرێت کە هەر جارە ژیانی گەورەپیاوێکی بخوێندایەوە دایدەگرت ٠ پاشان لەوە دڵنیابوو کە هەموو ئەو شتە سادەو بەڵگەو حاڵەتی قەزاو قەدەرانەی لە ژیانی خەڵکی تردا دەورێکی باشیان گێڕاوە لەو دوورنو چاوەڕوانکردنیان بێمایەیە ٠ بەڵام زوو بە زوو خۆی گورجکردەوەو خۆی دڵنیاکرد کە ئیتر وەختی ئەوە هات کە بەرەو ناوبانگو گەورەیی بە نەبەزینەوە بکەوێتەڕێ ، هەموو ئەو شتانەی لە ژوورەکەدان بەووردی پشکنییەوەو کورسییەکی خەیزەرانی وەهای دۆزییەوە کە دەشێ بکرێ بە «مۆدێل»و وێنەی بکێشێت٠بە لاق کەمێ کورسییەکەی ڕاکێشایە لای خۆیو زیاتر نزیکی کردەوە ، قەڵەمەکەی دادا ، دەفتەری وێنەکێشانی خستە سەر ئەژنۆیو دەستی بە وێنەکێشان کرد ٠٠٠ هێڵە کەم ڕەنگەکانی سەرەتای کاری وا هاتە بەرچاو کەوا بە شێوەیەکی تەواوو زۆرچاک وێنەی مۆدێلەکەی بۆ دەنوێنن ٠ بەپەلە و بە توندی بە مەرەکەب بەسەریاندا چووەوە ، پاشان دروشمە سەرەکییەکانی وێنەکەی زیاتر تۆخکرد ، لە قوڕنەیکیدا سێبەرێکی ئەستووری سێگۆشەیی زۆر پێجوان بوو سەرسامی کرد ، بۆیە بە شێوەیەکی ئاشکراتر دەریخست ٠

ئیتر لاوەکە سەری لەسەرداگرتو تاتوانی هێڵکێشیو سێبەر کاریی کرد تا شتێکي وا دەرکەوت کە وەختابوو دڵیبگوشێ ٠

پاشماوەیەکی کورت هاتەوە سەری ٠ دەستی بە کارەکەی کردەوە ٠ پاشان دەفتەرەکەی لە چاوی خۆی دوور

ڕاگرتو لە دوورەوە بە تیلای چاو بۆی ڕوانی . هات کورسی‌یەکەی بە ڕەنگێکی توخ ڕەنگ‌کرد . بە تووڕەیی‌و کەللەیی‌یەوە هێڵێکی تری کێشا . بە زویری‌یەوە سەیرێکی کورسی‌یەکەی کرد. ئەوەی ئەو وێنەی کێشابوو لە ڕاست‌ناکات وەکو بڵێی کورسی‌یەکە شتێکی وای تێدایە دەیەوێ تووڕەی بکات .

**بە توندی هاواری‌کرد :**

**ـ « ئەی شەیتانی لە قالبی کورسی‌ی حەیزەران ! هەرگیز گیانلەبەری وا ڕاڕاو بە گۆبەندی وەکو تۆم نەدیوە ! » کورسی‌یەکە قرچەیەکی لێوەهاتو بێ‌باکانە گوتی :**

**ـ « بەڵێ . تەنیا هەر سەیرم کە ؛ چاك لێم‌ووردبەرەوە . من هەر خۆمم . من هەرگیز خۆم ناگۆڕم » .**

لاوە وێنەکێشەکە نووکە شەقێکی بۆ وەشاند ، کورسی‌یەکە بە تەڕدەستی خۆی لێ‌لادا ، ئەم جار بە شێوەیەکی تەواو جیاواز خۆی نواند . لاوە خوێندەوارەکە بە تووڕەیی‌یەوە هاواری کرد :

ـ « کورسی‌یەکی حەیزەران . هەرچی هەتە شەل‌و شلەقاوە ، کورسی‌یە حەیزەرانەکە کەمێ گرمژی‌و بە نازو خاوو خلیچکی‌یەوە گوتی :

**ـ « لاۆۆ ! بەمە دەڵێن .. گۆشەی بینایی » .**

**ـ « گۆشەی بینایی کاری منەو تۆ کارت پێندانی‌یە . ئەمە باش لە بیر خۆتدا دابنێ » !**

کورسی‌یەکە بە هیچ جۆرێك وەڵامی نەدایەوەو وێنەکێشەکە لە ژوورە بن‌میچی‌یەکەیدا کەوتە هاتوچۆ هەتا یەکێك بە هەموو هێزی خۆی لەژێرەوە تەق‌تەق بە دار زەوی‌ی ژوورەکەی ئەمی کوتایەوە . کەوا لە ژێر ژوورەکەی ئەمدا پیرەمێردێکی زانا لە ژوورێك‌دا بوو زرمەزلێ‌و دەنگەدەنگی پێ‌قەبووڵ نەدەکرا . لاوەکە پاشان دانیشت‌و دووا وێنەی دەستدایە کە بۆ خۆی کێشابوو لێی ووردبووەوە . پێی باش نەبوو . چونکە خۆی لە ڕاستیدا لەمەبەجوان‌و شیرین تر دەزانی . بەڵێ ئەمە ڕاستە . ویستی دەست بە کتێب خوێندنەوەکەی خۆی بکاتەوە ، بەڵام جارێکی تر بەرامبەر بە کورسی‌یە پووشینە هۆڵەندی‌یەکە وەستانێکی درێژ وەستاو بە ڕقدا چوو .

لە ڕاستیدا دەتوانرێت بە شێوەیەکی گشتی بەزمێکی گەورەتر لە بەزمی ئەو کورسی‌یە پەیدا بکرێت .

لاوەکە لە سەر کلاوە هونەرمەندانەکەی خۆی دەگەڕا ·· ویستی تاوێك بچێتە دەرەوە · بیری کەوتەوە ، کەوا پێش بەینێك رەنگە زۆر نزیکیش نەبێت وای بەدڵدا هات کە بە هونەری وێنەگریی رازی نەبێت ، چونکە مرۆڤ لە دەردو ئازارو نائومیدی بەولاوە چیتری لێ دەستناکەوێت · پاشان چاکترین وێنەکێشی دنیا خۆ ناتوانێ لەو رووکەشی‌یە ساکارەی ئەو شتەی وێنەی دەکێشێ بچێتە قووڵایی‌یەوە ، بە کورتی پیشەی ئەو کەمە نی‌یە کە حەز بە قووڵایی شتبکات ·

**لە نوێوە بیرێکی کۆنی کەوتەوە یاد · چەند چاکدەبوو ئەگەر بیهینایەتە دی · بیرێك دەمێك بوو لە مێشکیدا تەونی داخستبوو خۆ ئەگەر تەواوی بکردایە بێگومان دەبوو بە نووسەرێکی بە ناوبانگ ·**

ئیتر کورسی‌یە حەیزەرانەکە بە تەنیا لەژوورە بنمیچی‌یەکەدا مایەوە پێی ناخۆش‌بوو خاوەنەکەی چووە دەرەوە · چونکە بە هیوای ئەوە بوو کە لە دواییدا بە دۆستایەتی‌یەکی سروشتی‌و دڵسۆزانە رێكبکەون ، لە ڕاستیدا دەیویست قسەیەك بکات · لەوە دڵنیایە کە گەلێ شتی بەنرخی وای هەیە دەتوانێ بۆ خاوەنە لاوەکەی خۆی بکات · بەڵام بە داخەوە ، وا دیارە ئەم کۆششەی ئەو بێکەلکە ··

**بیمار کردوویە بەکوردی**

# سەرچاوەی خۆشی

زانست تیشکی ڕووناکییە
سەرچاوەی خۆشیو پاکییە
پەیژەی سەرکەوتنی گەلە ،
مایەی سەربەرزیی کۆمەڵە
ئاسۆی ڕووناکی هیوایە
پرشنگی بیرو بڕوایە ،
هێزی کردارو بەرهەمە
هۆی شادی و لابەری غەمە
خوێندەوار بەدەستە ڵاتە
ڕۆڵەی بەکاری وولاتە
نەمێنێ نەخوێندەواری
دەژین ژینی بەختیاری

« کەریم شارەزا »



**لە شاعیرە ناوورنبووەکانی کورد :**

# زەوقی (١)

ناوی ئەحمەدبەگی زەوقی کوری شـاعیری بەناوبانگ ( عبداللـە بەگی مصباح دیوانە )لـە بنەماڵەی میرانی موکریانەو زمانی فارسیو تورکیو فەرەنسیو رووسی زانیوە بەمهۆیەوە لـە دەوری شاهەنشاهیی ئەحمـەد پاشای قاجـاردا چەندجارێك لە ئەنجومەنی ( پەرلەمانی تاران )دا ئەندامبووە لـە ساڵی ١٩٢٢ زایینی لە تەمەنی (٣٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە ·

ئەمەش نموونەیەکە لە هەڵبەستەکانی :

ئەو دڵە زۆر غافڵە گـەر عـەشقی جـانانی نـەبێ
بادەکـەی شیرین مـەزەی سوبحی بەیانیـانی نـەبێ

یاوەکـو مەجنـون نەبوبێ عـاشقێکی دەم بـەدەم
وە لـەرێی خـاکی وەتەندا مـەیلی سەردانی نەبێ

یا لە دەوری شەمعەکـەی رووی هەروەکو پەروانە زوو
دەمبەدەم « ئەفتـانو خیزان » مەیلی سـووتانی نـەبێ

یاوەکو بلبل لـە باخان بۆ گوڵی مـەقصودی خـۆی
کۆهی خـارا کون نەکـاتو نەخشی ئەیوانی نـەبێ

بۆ تەماشـای بەزمی خـەسرەو تا بەیان حوری بە جەم
کـەی ئەگاتە کـەی بە شیرین شەکەرین خوانی نەبێ

عاشقێـك خـاڵی کـەوانە رەهرەوێـکی بێ تـەریق
چۆن دەبێ واسـیل بـە مەقصـد لوتفی یەزدانی نەبێ

« زەوقیـا » شیرینە شیعرت خاسـە بۆ فـەرزانەکان
کوا دەگـا جاهـل بە مەعنـا یادی جـانانی نەبێ

---

(١) لە کتێبەکەی مامۆستا علی کمال باپیر لاپەڕە ــ ٣٠ ــ وەرگیراوە

# لاپەڕەیەك لە مێژووی ئەدەبی كوردیدا

## پەخشانی كوردیی

لـــە سەردەمی ئیسلامیدا : لەوانەیە پەخشانی كوردیی ئەم ماوەیە بـــكەین بە دوو بەشەوە :

أ ـ لە سەدەی حەوتی میلادەوە تا دوایی سەدەی نۆزدەهەم ٠

ب ـ لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم ( كە سەرەتای بووژانەوەو سەرهەڵدانی پەخشانە ) تا ئیمرۆ ٠

دەتوانین دان بەوەدابنێین كە ئەدەبی كوردیی ـ بە تایبەتی ـ لـــە دووای هـــاتنی ئیسلام پەخشانی هەبووە ٠ بەڵام پەخشانێك بەو واتایە كـــە هـــەموو تایبەتی‌یەكی پەخشانی هەبوو بێت ئەمەیان ناتوانرێ بچەسپێنرێ ، بەڵكوو ئـــەو چیرۆكو پەندی پێشینیانو مەتەڵو رازو نیازانەی كە بووە دەماودەم گـــەیشتووە بە ئێمەو نەنووسراونو بە تەواویی نازانرێ چۆن رێكخراون ، بە بەرهـــــەمی پەخشانی بەشی یەكەم دابنێین ٠

وە یا ئەو دووان‌دانو قسەو هان‌دانەی كـــە لـــە كاتی شەڕو شۆڕی نێوانی هۆزەكـــان ، وە یا نێوانی كوردو نەتەوە دراوسێكانی وتراونو هـــەرچەندەش نەكەوتوونەتە ســـەر كاغەز ٠

وەیا لەگەڵ ئـــەو داستانو چیرۆكە پەهلەوییو فارسیو عەرەبی‌یانەی كـــە بە كوردیی ووتراونو نەنووسراون ، ئەتوانین ئەمانە هەموو دابنێین بە پەخشان بـــۆ ئەو سەردەمانەی تیایا وتراون ٠

هەروەها ئەو دووان‌دانو ئامۆژگاریانەی كـــە مەلاكان لە مزگەوتو شوێنـــە تایبەتی‌یەكاندا وتوویانەو كردوویانە بۆ كوردەكان لـــە كاتی كاروباری ئایینیو

نوێژو جــەژندا · ئەمــانە هەموو پەخشانی ئــەو سەردەمانەمــان بۆ دەورئەکەنەوە ·

ئێمە ئـەم قسانە ئەکەین‌و ئەم بەشکردنانە دێنینە ناوەوە بەرامبــەر بــە ئەدەبی کوردیی‌و پەخشانی کوردیی ·

بــەڵام بچینە ســەر شتێکی راستی‌و ناوەرۆکەکەیەوە ، کورد لە دوولاوە لێ قەوماوە لایەکی گشتیی وەکو هەموو نەتەوەیەك · لایەکی تایبەتی ـ کە ئەمەیان هــەر بۆ کوردبووە ـ ·

گشتیی‌یەکە ئەوەیە کە ئادەمیزادەکە چەتوونە ، لە هەموو سەردەم‌و لاپەڕەی مێژوودا ، دەستەیەکی سەرکەوتوو ، کە هاتووە هەموو کــە لەپوورو شوێنەواری دەستەی ژێرکەوتووی لەناوبردووە · بەم جۆرە دنیا لــە بەرەبەیانی مێژوویەوە هاتۆتە خوارەوە ·

هەر نەتەوەیەك کــە ویستبێتی دەمێك بۆ کەلەپووری خۆی بەرێ ، لە دوو رێگە بەولاوە هیچی تری نەبووە،یا ئەمەیە پەنای بردۆتە بەر دەستەی سەرکەوتوو ، چی ئەوان دانیان پیاناوە ، ئــەو ئەوەی هێنــاوەو کردوویە بە بناغــە بۆ دروستکردن‌و پێکەوەنانی شتی سەرلەنوێ بۆ خۆی ·

یا ئەمــەیە هــەر بە تەخمین شتی دروستکردووەو ئــەو دروستکراوەی خستۆتە سەر کاغەز ـ ئەگــەر بووبێ ـ ، لەپاش چــەند بەرەیەك ئـەو شــتە دروستکراوە جێگای خۆی گرتووە ، بۆ بەرەکانی دووایی بووە بە بنچێك‌و لەســەر ئەوە رۆیشتوون وشتی تریان لێ زیادکردووە ·

بەڵێ دوور نی‌یە لــەم رۆژەدا کــە زانیاریی گەیشتوەتە پلەیەك تەنانەت زانایان تەمەنی بەرد دەردەخەن ، وە لەسەر ئەو تەمەن دەرخستنە پلەی پێشکەوتن و پاشکەوتنی ئادەمیزادەکانی پێشوو دەدۆزنەوە ·

وە یا پسپۆران بەردو بەڵگەی کۆن ئەدۆزنەوەو نووسراوێك ئەگــەر لــە سەریانەوەبێ هەڵیئەهێنن · بەڵام ئەمانە ئـەو تینویتی‌یە ناشکێنن کــە بە هەموو

جۆرو لــــه هــەموو ڕوویەکەوە سەردەمی مێژووی ئەو بەرانە ـ کـــه چــەرخ هاڕیونی ـ بۆمان روونبکەنەوە ، هــەر ئەوەندەیە سەرە دەزوێکەو هیچی تر !٠
لێرەدا جیایی لــــه تێوانی رۆژاواییەکەو رۆژهەڵاتیەکەدا نیە ، هــەر دوو لایان وەکو یەکنو هەردوولایان ئادەمیزادن ، هەردوولایان ئــەو سروشتەو غەریزەیەیان تێــدا هــەیە ٠
کارەساتە سامناکەکانی رۆمان کــه ئەیاننواند بە دەستەی ژێردەست ، پیاو کــه ئەیانبینیو ئەیانخوێنێتەوە مووچڕکی پیادێت ٠
کورد بــەو ناوەوە کە ئادەمیزادە ، لــه لاپەڕەی مێژوودا بەر ئەو لێشاوانە کەوتووە وەکو ئادەمیزادەکانی تر ٠ ئەمـــه شتە گشتیەکە ٠ ئەمجا تایەبەتیەیە کــــه :
ئەگــەر لێم بـگەڕێن مــن کارەساتو حــەقایقی مێژوو باسئەکــەمو هیچی تر :
کــه ئایینی پیرۆزی ئیسلام هــات ، کورد تا دوو ســەد ســالی پاش دامەزراندنەکەی،هەموو بە دڵێکی فراوانو بە هەموو ئارەزوویە کیەوە باوەشیکرد بــەو ئالایەدا ، بە دڵو بـــه گیــان خۆی لەژێر سێبەری ئالاکــەدا حەسانەوە ، لــەو رۆژەوە چ بە شیر ، چ بەقــەڵەم خزمەتی ئەم دینە ئەکــا تا ئەم رۆژە ئێمەی تێداین ٠ لــه هیچ سەردەمێکاو لــه هیچ رۆژێکیا بە جۆرێکی تێکڕایی لە دوو رێـگایەدا درێغی نەکردووەو نا شیکا ٠ بەڵام لە دوژای سەردەمی عەبباسی ، بەربەرەکانی حکوماتی ئێرانیو حکوماتی عوسمانی کوردی لــه ناوەدا کــرد بە ئاردی ناو دڕکانو کردی بە هەڵمات پێکیانا ئەدان !٠
ئەمانە لــه لایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە پابەند بوونیــان بـــه ئایینی ئیسلامەوەو خزمەتکردنیان بە علوومو زانیاریی ئیسلامیو زمـــانی عەرەبیەوە ، ماوەی ئەوەی نەداون کـــه بە زمانەکەی خۆیان شتێك بنووسنو شتێك بهێڵنەوە ٠
لەگــەڵ ئەوەشدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەنەبێ دژی ئــەم جۆرە شتانە بێت ٠

بەڵکوو گـەورەتر بەڵگە بۆ بەرزیی ئـەم ئا یینەو بۆ هاندانی ئـــەم ئایینە بۆ خوێندەواریی‌و بۆ زانین یەکەم ئایەتی «قرآن»ە :

« اقرأ باسم ربك الذی خلق ، خلق الانسان من علق ، اقرأ وربك الاكـرم ، الذی علم بالقلم ، علم الانسان ما لم يعلم » ·

هیچ ئایینێك لـــە عالەما نەبوو ـ ئاسمانی بوو بێ یا غەیری ئاسمـــانی ـ بەم جۆرە هانەهانەی خوێندن‌و خوێندەواریی بدا ·

ئەم گوێ‌نەدانی کوردە بە نووسین بە زمـــانی خۆی من نازانم چ ڕێـگەیەکی بۆ بدۆزمەوە ؟! هـــەر ئەوەم بۆ ئەدۆزرێتەوە کە : بەش‌کراویی کورد بووە لـەو ناوچانەدا و کشانی پەردەی تاریکی بووە بەسەریانا · لەلایەکەوە ئێران فیـــکری گوشیبوون بەوە گوایە لەگەڵ کورددا بران و فەرقی چییە با نووسین بە فارسی بێ ! لەلایەکەوە حکوماتی عوسمانی بە ناوی خەلافەتی ئیسلامی‌یەوە ئەم ئیشـــەی کـــە ئەکرد ، نەوەك هەر لەگەڵ کورددا بوو ، بەڵکوو لەگەڵ ئەو هەموو نەتەوانەشا بوو کە لە ژێر ئاڵای ئیمپراتۆرییەتا بوون ، بە عەرەبیشەوە ·

لـــە هەموو لایەکەوە ڕێگا لـــە کـــورد گیرابوو بۆ ئەوە بە زمانی خـــۆ بخوێنێ و شت بنووسێ‌و بیهێڵێتەوە ، تێکرای نووسین ـ تەنانـــەت نامەش ـ یا ئەبوایە بە زمانی فارسی بووایە ، یا تورکی،بۆ خزمەتکردنی علوومی ئیسلامی‌یش ئەوە بە عەرەبی بوو ·

بیرو فیکر وا گوشرابوو ئەگەر یەکێك کتێبێك ، وە یا پەخشانێك ، وەیـــا نامەیەکی بە کوردیی بنووسیایە بێجگە لەوە کە خۆی ئەوەی بەدڵا نەدەهات ، ئەبوو بە جارێ تیتاڵی‌ی لەناو مەردمیشا ·

لەبەر ئەم هۆیانە ئێمە ناتوانین پەخشانێکی ڕێك‌و ڕەوانی کوردیی ـ کـــە نووسرابێ ـ تا سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم‌و بەڵکوو نیوەی یەکەمی ئەو سـەدەیە بێنینـــە دەست · لـــە ئیمڕۆژیش بە دواوە نازانم ئەدۆزرێتـــەوە یان نەم ؟! نادۆزرێتەوە ، چونکە یا فارسی‌یە ، یا تورکی‌یە ، یا عەرەبی ·

بەم هۆیەوە ــ کەقسە لە خوێندەواری‌یەوە ئەکەم ــ دان بە دوو شتدا دەنێم ، دوو شتی زۆر گەورە بەرانبەر بەم کۆماری ئێستەی عراق ، یەکەم خوێنــدن بــە خۆرایی کە بڵاوی کردۆتەوەو خوێندن کەوتۆتە ژێردەسەڵاتی هەموو کەسێکەوە ، ئەم هانەهانەدانەی لەگەڵ بیری‌سەرەتای ئیسلامیشا جووت ئەبێ ، دووەم ئــــەو ماوەیەی داوە کە کورد بە زمانی خۆی بنووسێت‌و هیچ بەرهەڵستێك نەیەتە ڕێی ·

ئەوەبوو لــــە پێشترا وترا پەخشانی کوردیی لەپاش داهاتنی ئیســــلام تا ئەگــاتە سەدەی نۆزدەهەم ، ئەوی کە بە دەماودەم مابوویێتەوە بریتی بوو لە پەندی پێشینیان ، قسەی نەستەق ، مەتەڵ‌و چیرۆکی گوێ‌ئاگردان · کە ئەمانەی بەرەبەرە کوردەکە بەسەر زاریەوە بووەو گێڕاویەتی‌یەوە ·

ئێستە دێینە سەر باس‌کردنی‌ئەوانەو هێنانەوەی دەق بۆیان پاشان دێینە سەر باسی بەشی دووەم‌و جووڵانەوەی ئەو سەردەمە کــــە کوردەکە وەکوو نەتەوەکانی تر راپەڕینی ئەدەبی تێ‌کەوت‌و ئەو بەشانە کــــە لــــە ئەورووپاو نەتەوەکانی تری رۆژهەڵاتا پەیدا بوو لەمیشا هاتە ناوەوە ، وەکوو :

وتار ، نامە ، چیرۆك بە مەفهوومی تازەو پەیدابوونی نووسینی پەخشان لەو رۆژەوە کە رۆژنامەو گۆڤار کەوتۆتە ناوەوە ·

لە کتێبی « دەقەکانی ئەدەبی کوردیی »

مامۆستا علاء الدین سجادی هەڵبژێرراوە

# بۆ زاخاوی مێشک

ئەم ووشانە بە یەکێ لـەو مانایانەی بەرامبەریان لێك بدەرەوە ، ئەگـەر لە ماوەی (١٠) چرکـەدا ( ٨ـ١٠ )ت راستبوو ، زۆر باشیت • ئەگـەر (٥ـ٧)ت راستبوو باشیت • ئەگەر لـە (٤) خوارتربوویت ئەوا لاوازیت • بۆ وەڵامەکان سەیری لاپەڕە ( ٨٥ ) بکە •

١ ـ نمە :

(أ) نیوە

(ب) بارانی وورد

(حـ) نمایشت

(د) دروشم

٢ ـ کۆڵەوار :

(أ) کولەمەرگی

(ب) کولاو

(حـ) گیاندارێك کـە بـە برینی گەورە بریندار بوو بێت •

(د) مەردوومێکە کـە لە کارێـکدا نەزان بێت •

٣ ـ یەخ :

(أ) خانوو

(ب) جێگا

(حـ) ورێنە

(د) سەهۆڵ

٤ ـ تابـگە :

(أ) تالان

(ب) درەخشان

(حـ) شوێنێکی تایەبەتی یە لەگوێ رووبارو دەریا کـەڵەکو کەشتی تیا دەوەستێت •

(د) لبادی ڕاخستن

٥ ـ بازە :

(أ) بەڵەك

(ب) جۆرە مەلێکە

(حـ) ئومێد

(د) قۆڵو بازووی قەڵەو

٦ ـ تیلاك :

(أ) دەرمانکەردن

(ب) کەسێکە پێشی سـەری مووی پێوە نەبێت •

(ح) بنێشت

(د) تیمارکردن

٧ ـ پرسە

(أ) پرسیارکردن

(ب) پچڕاو

(ح) سەرخۆشیی کردن لـە خاوەن مردوو

(د) بۆکرووز

٨ ـ لێسە :

(أ) دوورکەوتنەوە

(ب) وونکردنی شت

(ح) جۆرە گوڵێکە

(د) خواردەمەنی زۆری خۆڕایی

٩ ـ کاوان :

(أ) جێکای ڕەقی سەر ملان

(ب) کاووڕ

(ح) جێگای سەوزی جوان

(د) لەسەرخۆ

١٠ـ قانگە :

(أ) کەسێکە نوێژی نەچێت

(ب) قاوو قریشك

(ح) دووکەڵکردن

(د) خەندەق دانەوەی دیوار

# هەڵبەست بۆ منداڵان

١ ـ کۆوەبوون مشکی ماڵان (١)
نەنەنكو مامو خاڵان
کلك باریكو چاوزیت
لۆز درێژو گوێ قیت
بیریان گەڕو گزی بوو
زەنگوڵێکیان دزیبوو
گوتیان بێهەستو چرپە
دەیخەینە کلکی گوربە
هەرکاتێ دەرچێ بۆڕاو
زەنگوڵە دەیکا بە قاو

٢ ـ سەرنەبەیان تاو هەڵات
مامرێوی لە کون دەرهات
لە سێبەری خۆی ڕوانی
بە درێژاییو پانی
خۆی ئازا هاتە بەرچاو
دەستیکرد بەچاو و ڕاو
گوتی وا بۆ ڕاو ئەڕۆم
هیچ نەبێ شێرێك ئەخۆم
گەلێ کردی ملومۆ
تا رۆژ هاتە نیوەڕۆ
سێبەر گەییە بەر سنگی
هیچی نەکەوتە چنگی
دیتی زۆری برسییە
دەیگوت تەماح باش نییە
هەر مشکێکم دەسکەوێ
بەسمە ورگم دەسرەوێ
خەیاڵ جێی نان ناگرێ
شێر بە رێوی ناخورێ

٣ ـ ئەی تۆپەکە فتبۆڵەکە
من دێم لەدەستم ڕامەکە
تۆ تۆپی یاری کردنی
وەك کوولەکەی ڕوحی منی
وەختێ کە چوویتە ئاسمان
بانگ‌کە لەگەڵ من یەك زوبان
خۆش‌بێ وەتەن بەرزبێ وەتەن
بە علمو فەن

(زەیۆر)

٤ ـ کەروێشك لەناو لانە
گوێی لەسەر پشت دانا
چاوی نووقان پرخەپرخ
نووست تا ڕاوکەر ووتی پخ
ئەمجا هەردوو گوێی لەقان

شانی پیاکرد به بازدان
کەروێشك ، نزیکە دوژمن !
کەروێشك ، ڕاکە قونەقون
(گۆران)

٥ ــ لاچۆ لاچۆ دەی بڕۆ
یاری‌ناکەم لەگەڵ تۆ
تۆ ئەلێی شێتو هاری
نازانی چۆنە ! یاری ؟
دارئەکێشی بە سەرما
جل ئەدڕێنی لەبەرما
بەباز ئەچیتە سەرکۆڵ
فڕێی ئەدەی بەردوخۆڵ
(ع٠شەونم)

٦ ــ پشیلەسوورە ختخت
بۆ خۆت لێ‌کردووم بە شت ؟
ئەی خاوەن چرنوكو قەپ
لەتۆ نایە گاڵتەو گەپ
بڕۆ میاومیاوی چیتە
سەر زلەی سمێڵ قیتە !
ئەی چاوبزەی چاو شینە
دڵم لەتۆ بەقینە
( کاکەی فەللاح)

٧ ــ کوڕە کوردم حەوت ساڵم
وردیلەو ڕوومەت ئاڵم
بۆ تامی‌خوێندن هاتووم
مامۆستا دەستبدە باڵم
(فەرەیدون)

٨ ــ ئەی مراوی ئەی مراوی
پەروەردەی گوێی چەمو ئاوی
بێ‌ترس خۆت ئەخەیتە ناوی
ناپرسی قووڵی‌و تەنکاوی
(عمر عبدالرحیم )

٩ ــ یاری‌کە ڕاکە پێ‌کەنە
بەرگی بێ‌کاری داکەنە
دەماری سستی هەڵکەنە
یاری‌کە ڕاکە پێ‌کەنە
(بێ‌کەس)

١٠ــ ئێمە کچانی وردین
نەوەی گۆرانو مەردین
بۆ خزمەتی نیشتمان
هەموو بەدەستو بردین
ڕەوشتی جوانو شیرین
داوێن‌پاکێتی‌و تەمکین
خوێندەوارێتی‌و ئەدەب
بۆ کچ ئەمانەن نگین
(أ٠ب٠ هەوری)

**(١)لەکتێبی ئەدەبی منداڵان ــ محمد رشید فتاح ــ وەرگێراوە ٠**

چیرۆکی منالان
لە ئەدەبی بیگانەوە

# دوو برا

**محەمەد فەریق حەسەن**
**لە عەرەبی‌یەوە گۆڕیویتی**

**لە سەردەمێکی دێریندا ، هێجگار دێرین ٠٠ لە وولاتێکی دووردا ، هێجگار دوورە دەست ، تەنانەت ئەمرۆکە ناوی لەسەر نەخشەی جیهانیش نابینرێ ٠ ئەوەندە هەیە ئەوساکە پێیان دەگوت وولاتی ( فەرستان ) ٠ جووتێ برا بەخۆشی‌و ئاشتی دەژیان ٠ باوکیان پارچە زەوی‌یەکی بەپیتی بۆ بەجێ‌هێشتبوون ٠ ئەمانیش داهاتەکەیان دەکرد بەدوو بەشەوە ٠**

هەموو ساڵێك لە سەرەتای مانگی ئەیلوولەوە ، دەستیان بە کێلان‌و خۆش‌کردنی دەکرد ٠٠ تۆوی گەنمیان پێوە دەوەشاند ٠

پاییزان بارانی پەڵەو تیشکی زێڕینی خۆر چەکەرەیان بە پیرە گەنم دەردەکرد ٠٠٠ زەوی‌یەکە بەلاسکی سەوزی درێژو بەهێز دەرازایەوە ٠٠ پەڵە گەنمێکی لێ‌پەیدا دەبوو ، نیشانەی ژیان‌و داهات‌بوو ٠٠ زستان‌و بەهار تێ‌دەپەڕین ، پەڵەگەنم هەر لە هەڵچوون‌و گەشەکردندا بوو ٠٠

لە کۆتایی بەهاردا گوڵە گەنمەکان وەکو زێڕ زەرد هەڵدەگەڕان‌و وەرزێ دروێنە سەری هەڵدەدا ٠ جارێکی تریش جووتە براکە دەکەوتنە خۆ ، بۆ دوورینەوەی بەری رەنجی ساڵ‌و ، ئارەقەی ماندوو بوونیان ٠ بەرۆژ دەستیان بە کۆکردنەوەی گوڵە گەنمەکان دەکرد ٠ کە ئێوارە دادەهات وەکو یەك مەڵۆکانیان بەش دەکرد ٠ ئەمجا هەریەکەو بەشی خۆی لە لایەکەوە دەکرد بەشارا ٠٠ بۆ حەسانەوەیش ، هەریەکە دەگەڕایەوە ( کووخەکەی ) خۆی ٠

**شەو داهاتبوو ، ( رەنج )ی براگەورە ، لە دەلاقەی کووخەکەیەوە ، سەرنجی ئەستێرەکانی دەدا ٠ خەوی لێ‌زڕابوو ٠ بیری لەکارێك دەکردەوە ٠٠**

لەبیری ماندوو بوون‌و ئارەق رشتنی ئەو رۆژەدا نەبوو ٠٠ بەڵکو بیری لە ( گەنج )ی برا بچووکی دەکردەوە ، چۆن شان بەشانی ئەم هەڵمەت دەباو گەوز

دەوەشێنێ ·· ڕەنجی براگەورە لـــە دڵی خۆیدا گوتی : « گەنجی برام ژن‌و منداڵی هەیە ·· ئەوان پێویستیان بە پۆشـــاک‌و خۆراک هەیە · بەڵام من تاقی تەنیام‌و کەسی وەهام نی‌یە بەخێویان بکەم ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەقەدەر بەشی ئـــــەو دەبەم ·· ئەم بەش‌کردنە ناڕاستەو ناڕەوا خێزانی براکەم پێویستی بـــە بەشـــی گەورەترە لەهی من » ·

ڕەنج بەو شـــــــەوە لە نوێنەکانی دەرپەڕی‌و چوو بۆ کێڵگە · باوەشی بـــە چەند مەڵۆیەکدا کرد لە شاراکەی خۆی‌و خستی‌یە سەر شارای براکەی ·· ئەمجـا ڕێ‌وڕێ گەڕایەوە کوخەکەی خۆی‌و بـە دڵنیایی‌یەوە خەوی لێ‌کەوت ·

لەو کاتـــەدا کە ڕەنج نووستبوو ، ڕووداوێکی سەمەرە رووی دا ·· هەر لەو دەمەدا ( گەنج ) لە کوخێکی تر ، لەسەر نوێنەکانی ڕاکشابوو · چاوی نەدەچووە خەو ، چونکە بیری لـــە براگەورەکەی دەکردەوە ·· لـــە دڵی خۆیـدا دەیگوت : « من ژنێکی ژیرم هەیە خۆشی دەوێم · منداڵم هەیە ، بوونەتە مایەی بەختیاریم · کـــــەپیر بووم‌و توانای کێڵانی زەوی‌و دروێنەم نەما ، ئـەوا منداڵەکانم گەورە دەبن‌و یارمەتیم دەدەن · بـــەڵام ڕەنجی براگەورەم تەنیا باڵە · منداڵی نی‌یـــە بەختیاری‌ی بۆ بڕەخسێنن‌و کە پیر بوو کۆمەکی بکەن · دڵم پێی دەسووتێ · بۆی بـــــــەداخم · ویژدانم ئازارم دەدا · نەدەبوو بەوجۆرە گوزرە گەنمەکان بەش بکـــەین ·· بەراســــــتی بەش‌کردنێکی ناڕاست‌و ناڕەوا بوو » ·

**گەنج لە جێگاکەی ڕاپەڕی‌و چوو بۆ کێڵگە · چەند مەڵۆیەکی لە شاراکەی خۆی هەڵگرت‌و بردی خستی‌یە سەر شـــــارای براکەی ، کە لەیەکەوە نزیک بوون ··**

خۆری بەیانی ، تـــاڵە زێڕینەکانی بەسەر شاراکانی گەنمـــــــە زێڕینەکەدا پەخش‌کردبوو ، تاکو ڕەنگە زەردەکەیـــان زیاتر بچریسکێتەوە ·· لەو دەمـــــەدا هەردوو براکە لەخەو ڕاپەڕین‌و هەریەکە خۆی گەیاندە شارای خۆی ، بەڵام هـــەر بەگەیشتنیان سەریان سووڕما ·· هـــەر یەکەیان چاوەڕوانی ئـــەوەی دەکـــرد شاراکەی خۆی لـــەهی براکەی بچووکتر بێ · کەچی هەردوو شاراکە چونیـــەک بوون !·

کەسیان وورتەیان لێــــوە نەهات ·

هەریەکە چووە سەر کاری خۆی ·
دەستیان بە دروێنە کردەوە · کە ئێوارە
داهات ، وەکو هەموو رۆژێکی‌تر
بەرلەوەی بگەڕێنەوە ( کووخەکانیان ) ،
مەلۆکانیان چون یەك دابەش کرد ·

وەك شەوی پێشوو ، دیسان
هەرکەسە لای خۆیەوە بەو تاریکی‌یە
راپەڕی‌و چەند باوشێکی لە شاراکەی خۆی
خستە سەر بەشی براکەی · کەچی کە
بەیانی رۆژی داهاتوو راست بوونەوە ،
سەرنجیاندا شارای هیچ لایەکیان لەهی
ئەوی‌تر زیاتر نی‌یە ··

بۆ شەوی سێ‌یەم هەردووکیان
هەلسان وەکو شەوەکانی پێشوویان کرد ،
بەلام ئەمجارەیان لە یەك‌کاتدا
هەلسان · لەودەمەدا کە هەر یەکەو
چەند مەلۆیەکی پێ‌بوو ، بۆ سەر شارای
ئەوی تری دەبرد بەیەك گەیشتن !·· بە
سەرسووڕمانەوە هەر یەکەو بۆ ئەوی تری
دەڕوانی · تیشکی مانگ لەسەر
( روخساریان ) دەشکایەوەو جوانی‌یەکی
بێ‌وێنەی پێ‌دەبەخشین !·· دەستیان
شل‌بوو ، مەلۆکان بەربوونەوە !· هەر
بەوشێوەیە تاساوەیەك مانەوە ،
نەیاندەزانی چەندە ؟·· نەشیان دەزانی
چی‌بکەن ؟·· ئەمجا هەرکەسەو خۆی
هاویشتە باوەشی براکەی‌و فرمێسکی
شادی بە چاویاندا شۆڕ بووەوە !! هەردوو
لایان بەوەیان زانی کە چەند
خۆشەویستی‌و برایەتی‌یەکەیان راست‌و
گەورەیە ·

ئەمجا رەنج‌و گەنج ئەو مەلۆیانەیان
هەلگرتەوە کە نیازیان وابوو بیخەنە سەر
شارای یەکتر · کردیان بە گورزەیەکی
گەورەو بردیان لەسەر گردێکی بلند
دایان‌نا تا ببێتە یادگارێکی گەورەی
خۆشەویستی‌و برایەتی‌و هەر بمێنێ ·

**رۆژگارو سالگار تێ‌پەڕی ··
فەرمانڕەوای وولاتی فەرستان ویستی
پەرستگایەکی گەورە بنیات بنێ تاکو لە
مێژوودا ناوی بەنەمری بمێنێتەوە ···
نوێنەری بۆ هەموو لایەکی وولات رەوانە
کرد ، بۆئەوەی شوێنێکی لەبارو گونجاوی
بۆ بدۆزنەوە شایانی ئەو پەرستگایە بێ ·
بەلام هیچ شوێنێکیان لەو گردە بەرزە بە
گونجاوتر نەزانی ·· تاکو هەرکەسێك
پێی نایە ناو پەرستگاکەوە ، چیرۆکی
دوو براکەی بێتەوە یادو ببێتە نموونەیەك
بۆی ·· ئەویش هەولێدا بۆ گەشەکردنی
خۆشەویستی لە نێوان براکانیاو ، لە
نێوان هەموو مرۆڤدا ·**

# بنچینەکانی شانۆی نوێ

**نووسینی : عدنان المبارك**

ئەو شەپۆلە شانۆییە نوێیانەی کە بە بێ دەست گێڕانەوە پەلاماری کۆنینەکان دەدەن دەگەڕێنەوە چەند سەردەمێکی دوورودرێژی وا کە ڕووداوەکانیان بە شارەگی بەرهەمی ئەمڕۆ دەژمێردرێن · سەردەمی ئەو ڕووداوانەش ، لێکۆڵەرەوەکان ناوی‌دەنێن سەرەمی ( ئیصلاح ) یان پێش‌خستنی گەورە ·

هەندێ نووسەر لە باسی ئەم دیارکەوتەی پێش‌حستنەدا بەلای ئەوەدا دەچن کە دەست بە بنەڕەتی دایالکتیکی‌یەوە بگرن‌و بەسەر ئەم کردەوەیەدا جووتی‌بکەن · ئەو کردەوەیەی کە پێگەیشتنێکی دینامیکی‌یانەی هەیەو ڕێبازە تازەکان تێیدا مل‌ملانێ دەکەن‌و هەندێکیان جێی هەندێکیان دەگرنەوە · لە ڕاستیشدا کردەوەی پێش‌خستنەکە نزیکەی یەك سەدە زیاترە دەستی پێ‌کردووە · کەوا

لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووا بزووتنەوەکانی نوێ کردنەوەو پێش‌خستن سەریان‌هەڵداو تین‌و تەووژمیان پەیداکرد پاشان ساردبوونەوە هەتا بە هۆی کارتێکردنی دوو ڕووداوی گەورەوە ئەمجارە بە گوڕتر ژیانەوە کە بریتین لە شەڕی یەکەمی جیهانی‌و شۆڕشی ئەکتۆبر · پاش ئەمەش شەڕی دووەمی جیهان ئاوەڕۆی سروشتیانەی شەپۆلی ئیصلاحی وەستاند ، بەڵام هەر کە شەڕەکە دوایی هات دیسان زەوی‌یەکی باش‌و بەپیت‌تر بۆ هەڵدانی گۆڕان‌و تەفاعولی توندتیژانە ڕەخسا · دینەمۆی ( ئیصلاحی گەورەش ) بەربەرەکانی‌و دوژمنایەتی کردنی قوتابخانەی ریالستی‌و طبیعی بوو کە ئەوانیش لەکاتی خۆیاندا رومانتیکیان هەڵبواردبوو ·

نووسەران لەوەدا ڕێکن کە هەوڵ شەقاوی بێ‌فیزیی ڕووەو (ئیصلاح) چەند شانۆیەکی مەیلەو نەناسراو هاویشتوویانە وەکو شانۆی مانگەری ئەلمانی ( ١٨٦٠ ـ

١٩١٨ ) كـــه هـــهوڵیدا رەگـــــەزی فەنتازیا لــــە پێشكەش‌كردنی شانۆییدا وەدەرنێ‌و لەبابەت ڕووداو و جل‌وبەرگ‌و دیـــكۆرو كـــەلوپەلو شتی ترەوە تا ئەوپەڕی ڕۆژدی دەست بـــە راستـگۆیی مێژوویی‌یەوە بـگرێت ٠ هـــەر ئـــەم شانۆیە بابەتێكی نوێی واشی هێنـــایە كایەوە كـــە لە پاشدان بووە بنكەیەكی ناسراوی شانۆی پێشڕەوایەتی ئەمیش بە لاوەنانی پیشەی پێش‌كەش‌كردنێك كـــە بـــە یاری‌كەرێكی سەرەكی پێك‌دێت ، وە پەیڕەو كردنی بنكەی یاری‌كردنی بـــــە كۆمەڵە كـــە وەكو دەزانین ئەمـــەش دەوری یاری‌كەری ـ ئەستێرە ناهێڵێ ٠ جا ئـــەم شانۆیەی كـــە بـــە شێوازێكی نیـــگاركێشی‌و رێكوپێـــكەوە راستیی بابەتییانە ( الامانة الموضوعية )ی پاراست بە لێوەشاوەیی‌وكـــارامەیی خۆی ناوی ( شانۆی هونەری )وەرگرت ٠ ئەمڕۆش تەئسیری ئەم شانۆیە بەسەر پێش‌خەرانی لەمـــەودوای وەكـــــو ستانسلافسكی‌و راینهاردتەوە لای هەموو كەس زۆر باش ئاشكرایە ٠

**شانۆی رزگاركەر :**

شـــانۆی رزگاركەر Theatre Libre (١٨٨٧ ـ ١٨٩٥ ) لە پاریس پەیدابوو ٠ ئەندریە ئەنطوانی دامەزرێنەری یەكێك بوو لــــە فەرمانبەرانی دەزگای غـــازو هەر لە لاوە دەستی بە شانۆ دەگەیشت ٠ بیروڕای ئـــەو وابوو كـــە شانۆ دەبێ بەربەرەكـــانێی بەبەردبوونی رۆتینی بكات‌و رێ لەبەردەم تازە پێگەیشتووان‌و دراماتۆجیای نوێی سروشتی سەركەوتوو بـــكاتەوە كـــە ئەمیل‌زۆلا ئەوســـا لە مەیدانی ئەدەبدا رابەری بوو ٠ ئـــــەم شانۆیەش یەكەمین شانۆییەكانی كـــــە پێشی كەشی كردن هینەكانی ئەمیل‌زۆلا بوون كـــــە لای وابوو فەرمانی هونەر سەرلەنوێ دروست‌كردنەوەی ژیانـــە بـــە ووردی ٠ ئەنطوانیش پەیڕەوی ئـــــەم بیروڕایەی كرد ئەوەبوو لــــە شانۆیی ( قەسابەكان ) كەلەشێكی تەواوو لـــە شانۆییـــەكی تـــردا ( شـــەذروان ) ئاوپڕژەیەكی بەراستی دانابوو كـــە ئاوی هــــەڵئەدا ٠٠ شێوەی یاری‌كردنی ســـەر شانۆش هــــەر بەم پێیە دەقی‌گرت‌و شتی ( رۆژانە ) پارێزراو شێوەی شانۆیانەو قسەكـــــــردنی هونەرمەندانە یان پێش‌كەش‌كردنی بە دەبدەبە یان بـــــە

کەرستەی هەڵچوون و ئینفیمالی شانۆیانە پشتبەستووی ، بەلاوە نا ٠ چونکە ئەم کەرستانە بە میراتێکی قورسی سەردەمی رۆمانتیکی دادەنران ٠

رەنگبێ گەورەترین کارێ کە هاوچەرخانی خۆی حەپەساندبێ ئەوەبووبێ کە ئەلفرێد جارێی دانەری ( مەلیك ئۆبۆ )ی دۆزییەوە کە بە باوکی دادائی و سوریالی و پێشتر کەوتەی شانۆی ناماقوولی ئێستا دادەنرێت ٠ ئەنطوان لە ساڵی ١٩٠٨دا ( مەلیك ئۆبۆ )ی پێشکەشکرد ٠

لە ساڵی ١٨٩٦دا شانۆکە ناوی گۆڕاو بوو بە ( شانۆی ئەنطوان ) تائێستاش ماوە ئەگەرچی گۆشەکانی بایەخدانی گۆڕاوەو وازیشی لە ( سروشتایەتی ) هێناوە ٠ ئەنطوان لە ڕاستیدا مصلحێکی تەواو بوو ساڵی ١٩٤٣ مرد و شایانی ئەو ووتە نەستەقانەیە کە لە فەرەنسادا دەگوترێت « ئەنطوان خۆی ٣٠ ساڵی مێژووی شانۆی فەرەنسییە » ٠

**قۆناغی پێشخستنی گەورە :**

**شانۆی هونەری و شانۆی هونەر**

( شانۆی هونەری ) لە ساڵی ١٨٩٠دا پۆلفۆر دایمەزراندو پاش سێ ساڵی تر بوو بە ( شانۆی هونەر )و لایەنگرانی لە ئەلمانیاو ئینگلتەرا بۆ پەیدابوو ٠ لونییە ـ پۆی دامەزرێنەر یەکێك بوو لە قوتابییانی ئەنطوان بەلام ئەو ( سروشتایەتی ) یەکەی مامۆستای بە لاوە ناو خۆی لە بەرەیەکی ترا قایمکرد و شانۆی شیعربابەتی پێشکەشکردو لە دیکۆردا بایەخی بە لایەنی تەشکیلی دا ٠٠ نووسەرانی ئەم شانۆیەش نووسەرە رەمزییەکانی وەکو مەتەرلنگ و رامبۆ بوون ، کە لە هەڵبەستی کەشتییە سەرخۆشەکەی رامبۆ شانۆییەك دەرهێنرا ، و پاش ئەمەش شانۆییەکانی کلۆیل و نووسەرانی دیکەی فەرەنسی و بێگانەی پێشکەش دەکرد ٠

**ئەدوارد کریج و ئەدولف ئەبیا**

کریجی ئینگلیز ( ١٨٧٢ ـ ١٩٦٦ ) بە باوکی پێشخستن دادەنرێت کەوا وەرچەخانێکی تەواوی سازکرد ئەگەرچی شانۆیەکی تایبەتی خۆی نەبوو بەلام وەکو دەرهێنەرێك و نەخشەکێشێك و تیوریزانێك سەرەتای ئیصلاحی راستەقینەی دەستنیشانکرد ، کەوا فیکرە بنەڕەتییە

کـــەی دروستکردو ئەوەی پێیدەڵێن ( سەربەخۆییبوونی شانۆ)ی دارشت ۰

ئەم ڕێگەیە وا لە پیشاندانی شـــانۆ دەکات بە جۆرێك کـــە کارێکی هونەری سەربەخۆیەو لـــە هونەرەکانی تر جیایە ۰ لـــە ڕاستیشدا ڕێگەی کریج وێنـــــەی دووبارەی ئارەزووی خەڵکەکەیە بۆ ڕزگار کردنی هونەرەکان یەك لـــە دەستی ئەوی تر ، وە دروستکردنی هەر هونەرە لـــە حالەتی پاکیو پەتیی خۆیدا ۰ جا بەم چەشنە نیگارکێشانو مۆسیقا لـــە ئەدەب یان مۆسیقا لە سەماو ۰۰۰ هی تری ۰۰ ڕزگـــــارکرد ۰ ئەوەی بەلای ئەوەوە مەبەست بوو ئەو نرخانە بوون کـــــــە یەکەیەکەی هونەرەکانیان دەگـــەیاندو بایەخدان بوو پێیـــــان بەبێئـــەوەی هەوڵبدات لە هونەرەکـــــانی تر شتێك بخوازێتەوە ۰

کریج هەوڵیدا شانۆ (پاكبکاتەوە) ئەمەش بە وەستان لـــە دژی دەسەڵاتیی ئەدەب یان تەشکیل یان مۆسیقاو دیتی کە نووسەرانی مەیدانی درامـــــاو مۆسیقاو ئەوانی تر لایانوایە کە هەقی خـــۆیانە ئەگـــەر پایـــەی یەکـــەمی پیشاندان (عرض)یان بەرکەوێ ، لە کاتێکدا کـــە شانۆیی نە ئەنجامو نە کۆڕی کاربازیی ( تفاعل ) ئـــەم هونەرە سەربەخـــۆو جۆراوجۆرانەیە بەڵکو خۆی هونەرێـــکی سەربەخۆ و جـــودا و خۆتەواوکردووە ( متكامل ذاتيا )و خاوەن هۆو ڕێوشوێنو دەستووری تایبەتی خۆیەتی ۰ بۆیە دەبێ شانۆ سەربەخۆبێتو لە چەرخی دەسەڵاتی بێگانە بەخۆی ڕزگاریبێت ، بەڵکو دەبێ ئەم ئەوان ملکەچی دەستوورەکانی خۆی بـــــکاتو بیانخاتە سووڕی چـــەرخی خۆیەوە ۰

ئەم بنـــــەڕەتی سەربەخۆ بوونی شانۆیەی کە دەگەڕێتەوە حەفتا ســـــاڵی پێشوو ئەمڕۆ شانۆی داگرتووەو لـــــە تیوریی (البنائيه)دا گەورەترین پشتو هێزی بۆ خۆی دۆزیتەوە ۰

کریج ئێجگار بە توندی بەربەرەکانیی شانۆی کۆنی کردو نەیکرد هەر بـــــە ناوی هونەریشەوە سەیریبکات ، پاشـــان هەر ئەوە نەبوو کە پەلاماری ( سروشتی ) بدات بەڵکو تەنانەت شێوەی قسەکردنی سروشتی ئاساییو ئیستو جووڵانەوەشی دا بەر زەبری هێرشو داوایکرد کـــە لە

جیاتی ئەمانە نرخە (ژیانی) یەکانی‌تر بە شێوەیەکی دارشتەی تایبەتی بێنە کایەوە کە سەرتاپای مانای پێش‌کەش کردنی شانۆیی خزمەت دەکەن . لاشی وابوو کە یەکە نرخ لە نرخەکانی شانۆ ئیستەو جوولانەوەو سەمایە . هەروەها نرخەکانی ( شانۆی ئەدەبی )شی دایە بەر پەلامارو پێش‌بینیی ڕمانی دراماتورجیای ئەدەبی کردو گوتی شانۆی دوارۆژمان وازی‌لێ‌دەهێنێ بەراستیش ئەم پێشبینیی‌یە وا لە شانۆی ئەوروپا هاتۆتە دی کەوا بە چاوی سووک دەڕواننە دەقی ئەدەبی‌و لە جیاتیان پەنا دەبەنەبەر سیناریۆی تایبەتی . لەگەڵ ئەوەشدا کریج چیروکەشانۆییەکانی ئەدیبانی هەر پێش‌کەش‌دەکرد ئەگەرچی سووربوو لەسەر جیاگردنەوەی دوو شێوەی سەربەخۆی دوورە پەیوەندی بەیەکترەوە یەکەمیان ئەوەی کە ئەدەبی‌یەو تەنیا بۆ خوێندنەوە تەرخان‌کراوەو ئەوەی تریشی کە نرخەکانی شانۆیی هەیەو بەکەڵکی پێش‌کەش‌کردن‌و کاری شانۆیی‌و تەماشاکردن دێت .

کریج کاتێ کە هونەری شانۆیی سەربەخۆ شی‌دەکاتەوە ناوی ئەو هونەرانە ناهێنێ کە پێویستە خزمەتی شانۆ بکەن‌و لە چەرخی ئەودا دەخولێنەوە ، بەڵکو تایبەتی‌یە سەرەکی‌یەکانیان لەچاو شانۆدا جیادەکاتەوە : هونەری شانۆ بە دەورگێڕانی پیشاندەران یان بە دراما یان پێش‌کەش‌کردنی شانۆیی یان بە سەما نی‌یە ، بەڵکو لەسەر پێچکە سەرەکی‌یەکانی خۆی رادەوەستێ کە بریتین لەو : ئیستە کە گیانی پیشاندانەو لەو ووشانەی کەوا لەشی درامانو لەو رەنگانەی کەوا کاکڵی دیکۆرن‌و لەو ئیقاعەی کەوا نویشکی سەمایە .

هەروەها کریج دژی (تصمیم)ی شانۆیی ئەوسا وەستا کەوا بە کارێکی وێنەگری‌ی پەتی دادەنرا ، هەروەها دژی ئەوەبوو کە تەختەدار بە بەرجەمتەکردنی بینراو ( تجسید المنظور ) یان ئەوەی کە ناوی نرابوو ( شانۆ ـ قوتوو ) دابندرێت ئەو خۆی تەختەداری شانۆی بە شوێنی کردەوەی شانۆییانە دەزانی کە سێ ڕەودای راستەقینەی بە گوێرەی پلسایەکی

میمماریی ڕێکخراو هەیە • داواشی کرد کە لە (تصمیم)دا دەبێ هێڵە درشتەکان هەروەها کاریگەریی ڕووناکیو شەکلی ساکار بەڵام دینامیکیش لە ئارا دابێ ئەمەش هەمووی لە نێوان بەستنەوەی دیمەنی تەختەی شانۆ بە دەورگێڕانو تەعبیری یاریکەرەوە دا •

(کریج) بیرو لێکدانەوەکانی خۆی لە کتێبێکدا خستەڕوو ناوی «دەربارەی هونەریشانۆ» کە لەساڵانی ۱۹۰٤ _ ۱۹۱۰دا لە شێوەی دوو دەمەتەقێی نێوان تەماشاکەرو (مخرج‌دا) نووسیو بە گەلێ زمان وەرگێڕدراو چاپکراو لە هەر شوێنێ شەپۆلو هەوێنی تازەی لە شانۆی ئەورووپادا ڕادەپەڕاند و ئەگەرچی نووسەری کتێبەکە بیرو لێکدانەوەکانی خۆی خستبووە قالبی خەونانەوە کە لە دوارۆژدا بێنەدی بەڵام هیوا پەیدابوون کە زوو کەوتنە هێنانە دیی لە ئێستادا و بەشێکی زۆری پێشبینییەکانی کریج هاتەدیی وەکو پاشەکشەی دەوری (ممثل)و دەسەڵاتدارێی ( مخرج ) • بەشێوەیەکی گشتی کریج کارێکی وای کردۆتە سەر شانۆی ئەورووپایی کە کەس ناتوانێ ژێر لێوی بخات ، جێپەنجەکەشی دەتوانین بەنموونە بەسەر شانۆی شۆرشگێرانەی رووسی یان شانۆی بریختەوە بە ڕوونی ببینین تەنانەت پێشرەوی شانۆیی ئەمڕۆ ( غرۆتۆفسکیو شانۆ ـ مختبرەکەی ) رەگەکانی دەگەنەوە سەر بیرو لێکدانەوەی ئەم پێشڕەوە بەناوبانگە •

زۆر وادەبێت کە ناوی کریج لەگەڵ ناوی پێشڕەوێکی تر دەبیستین کە ئەدۆلف ئابیای سویسرییە ئەگەرچی کە ئاشنایەتی لەنێوان هەردووکیاندا بێ‌هێزەو بناغەیەك نییە کە تەئسیری هەر یەکێکیان لە شانۆی لەسەر بەراووردبکرێت ، ئەوەبوو ئابیا خۆی تایبەتیکرد بە پێشکەشکردنی شانۆییەکانی ڤاگنەرەوە هەوڵیدا جەوە موسیقاو ناوەرۆکییەکان بڕژێنێتە شێوەی پێشکەشکردن هەروەها هەندێ نمایشی شانۆیی پەیداکرد کە نرخە بنەڕەتییەکانی بریتییە لە ریزکردنو نواندنی هەندێ بارستایی ئەندازەیی کەوا بۆ ئەوە باش بوو کە تەئسیری

رووناکی‌ئامێزی هاوپەیوەندیی بـــــە شاعیریەتی دەقەکـــەو لایەنی مۆسیقایی پەیدابکات ٠٠ لای وابوو ئا ئـــەم جۆرە شانۆییەی ئیقاع‌دارە کارێکە لەکارەکانی ( هونەری زیندوو ) ٠

**پێش خەرانی رووس :**

شانۆی رووسییش رێـــگای تطورێکی هاوچـــەشنی گرتەبەر لـــــە قۆناغی سروشتی‌یەوە دەستی‌پێ‌کـــــرد بـــەلام شۆرشی ئەکتۆبەر ئاڵوگۆری جیـاوازی تری هەلایساندو دەرکەوت کە سەرپێیین‌و لـــە کۆتاییدا گــــەرانەوە ســـــەر ( ئەکادیمی ) ٠٠ ئیتر با لە شــــانۆی هونەریی مۆسکۆوە دەست بە باس‌بکەین کە لـــە ساڵی ١٨٩٨ کراوەتەوەو رێبازی سروشتی دەنواند ٠ کاتێك کـــە ویستی (عطیل) پێش‌کەش‌بکات تیپی تەمســـیلی ناردە قیبروس بۆئەوەی شوێن‌و کەشـێکی وا ببینن کـــە نزیك بێ لـــە جـــەوە شەکسپیری‌یەکان ، هەروەهاکـــە یۆلیۆس قەیسەریشی پێش‌کەش‌کرد وەهای کرد ٠ لەسەر تەختەی شانۆش هەموو شت راست‌و راستەقینەو لەجێی خۆیدا بوو ئەگـــەر باران بوایە یان تاقـــگەو گوێت لـــــە قوولقـــــەی کەڵەباب‌و حەپەی سەگ‌و هتد دەبوو ٠٠ هەر بەم شێوەیە رێبـــازی سروشتی پەیرەوی واهیمــــەی ( دیواری چوارەم )ی دەگرد کـــــەوا مثل لـــە تەماشاکەران دابڕدەکات جـــا لەبەرئەوە پێویست بوو کارێـــکی وا بکات کـــــە بزووتنـــەوەو رەووشتی رۆژانە بـــە تەبیعیانە پیشان بدرێت‌و ( ممثل ) لـــە هەلسان‌و دانیشتنی‌دا وەکو لـــە مـــالی خۆی‌دابێ وابێت ٠

دامەزرێنەرو بەرێوەبەری ئـــــەم شانۆیە کونستانتین ستانسلافسکی بـــوو ( کە نـــاوی راستەقینەی ئەلکسییفە ) ١٨٦٣ ـ ١٩٣٨ ـ پێشان ســـەرپەرشتی کردەوەکانی ئارەزوومەندانی دەکرد ، لە دواییدا بە یارمەتیی بازرگانانی موسکۆ بە هاوکاری لەگەڵ ڤلادیمیر نمروفچ ـ دانچنکا ، شانۆی هونەریی موســکۆ ەی دامەزراند ٠ نیشانە بناخەیی‌یەکەی کاری ستانسلافسکی بریتی‌بوو لە حالـــــەتی تێربوون‌و دڵنیانەبوون لـــــــە ئەنجامە دەســــــتکەوتەکان با دەســـــــتوورو بنەرەتـــەکانیش روون‌و ئاشـــکرابن‌و خۆئامادەکردن بــــۆ پێش‌کەش‌کردنی

شانۆکەش باش بوو بێت ٠ لێـــــرەوە ( قلـــــق )ێکی دروستکەر سەری‌هەڵدا پەیتاپەیتا خەریکی تاقی‌کردنـەوەی زۆر بوو بۆ گەیشتنە چاکترین چارەسـازی ٠ جا لە سایەی ئەم ڕێگەیەوە ستانسلافسکی توانی لە پایەیەکی بەرزی هونـــەری‌دا شانۆ پیش‌کەش‌بکات‌و لەمەوە ناوبانگێکی زۆری لە روسیاو دەرەوەی ڕووســــیا پەیداکرد ٠ هەر بـــەم جۆرە شانۆکانی لە ئەوروپاو لە ئەمەریکادا ڕێ‌وشوێنێکی بەرێزیان لە جیهاندا بۆ چەسپاند ٠

لەگەڵ ئەوەش کە ئەم شانۆیە مەیلی بەلای ( سروشتی )یەوە ئاشکرابوو ، بەڵام ستۆدیۆی ئەم شانۆیە بوو بە قوتابخانەیەك هەموو ئەو موصلیحانەی تێدا دەرچوو کە لە سەردەمی شۆرش‌دا چالاکی‌یان نواند ٠ ئەمانە گەلەکۆییان لە ستانسلافسکی کردو ناوی کۆنەپەرستی‌یان بەدواداخست ٠ لەو ماوەیەدا شانۆکە چالاکی‌یەکی گـەورەی ئەوتۆی نوانـــد کـــە لــــەو سەردەمەدا شتێکی چاوەڕوان‌کراو نەبوو ٠ لەنێوان ساڵانی ١٩٢٢ـ١٩٢٤دا ئــــەم شانۆیە گەشتێکی بە زۆر شاراندا کــردو ئەوســـا پێشـــنیاری کتێب‌فرۆشانی ئەمەریکای پەسندکرد بـــۆ چاپ‌کردنی یادداشتەکانی خۆی لەبابەت شانۆوە ٠ لە ساڵی ١٩٢٨ یشدا لە ئاهەنگێکدا بەبۆنەی یادی سی ساڵەی دامەزراندنی شانۆکەوە بە (بەطریکی) شانۆی سۆڤیەتی داندرا ٠

کاتێك کـــە مـــاوەی زریانەکـــانی شۆرشگێری بەســـــەرچوو شــــەپۆلی شۆرشگێڕی‌ی شانۆیانەش داکەوتەوە ٠ لە ڕۆژانی دواییدا پەیوەندی‌ی بە پێشرەوی شانۆیانە پچڕا سەبارەت بەوە کە لــــەلای گوێ‌گرانی بەکۆمەڵەوە هەزم‌کراو ، ئیتر سەردەمی ئەکادیمیەتی‌و ( اعتـــدال = نەرموشلی ) هات‌و سەرلەنوێ ئەستێرەی ستانسلافسکی بەرزبووەوەو شـــــانۆی هونەری‌ی مۆسکۆ کرا بـــــە دەزگایەکی دەوڵەتی‌ی نموونەیی شانۆ و لــــە ساڵی ١٩١٩ صیفەتی ( ئەکادیمیی ) بـــــۆ زیادکراو بە زمانی ڕووسی بە قوڵەکراوی بوو بە ( مخات ) واتا شانۆی هونەری‌ی ئەکادیمی‌ی موسکۆیی ٠

بەرلـــەوە هەر لــە ســالی ١٩٠٦ەوە ستانسلافســـــکی پاش گەشـــــتێکی هونەرمەندانە بە شارانی ئەلمانیـــــاو نەمسادا گەڕاو ناوبانگێکی جیهـــــانی

پەیداکردو کارێکی گەورەی کردە سەر شانۆکانی ئەوسای ئەڵمانیا ۰

سیستەمی ستانسلاڤسکی‌و شێوەی کاری لەگەڵ ( ممثل )دا ئیعتیماد دەکاتە سەر ڕشتەی شاعرانەیی هونەرە پێشکەش‌کراوەکان ۰ لە شانۆدا بە ڕادەی یەکەم بەرهەمی رووسی نیشاندەدا بەو هۆیەوە دڵی تەماشاکەرانی رووس‌و دەرەوەشی رادەکێشا ، ئەوەبوو ساڵی ۱۹۱۲ ( برایانی کارامازۆف )ی بە دوو بەش پێشکەش‌کرد ، لە ۱۹۰٦دا ( لالەفانیا )و ( باخی گێلاس )و ( سێ خوشکەکە )شی لەساڵی ۱۹۰۹و ۱۹۱۰دا پێشکەش‌کرد ، ئەمانە لەوساوە تا ئێستا وەکو چەند بڕگەیەکی چەسپاون لە بەرنامەی‌کاری شانۆی ( مخات )و هێشتا هەر بە وێنەی نموونەیی دەژمێردرێن ، ستانسلاڤسکی کە شانۆکانی ابسن‌و شکسپیری پێشکەش‌کرد هەروەها بە دوا ڕێگەو شێوەی تازەدا دەگەڕا ، هەر بەم جۆرەش بە شوێن شێوازی تازە دەکەوت کاتێ کە دەسی لە کاری رەمزی‌یەکان دەدا ، بەوێنە جۆری پێشکەش‌کردنی شانۆیی ( مەلی‌شین )ی مەترلینک ئێجگار بەناوبانگەو سەیریان‌کرد جێ پەنجەی کاری شانۆی ئەنطوانی پێوەدیارە ۰۰ جگە لە مە ویستی خۆی لە کریج نزیك‌بکاتەوە ، وەکو زانراوە ( کریج ) لە کتێبەکەی خۆیدا دایالوگی دووەمی بۆ شانۆی موسکۆ تەرخان‌کردو کە تێیدا زۆر ڕێزی لە چالاکی‌و پشوودرێژی‌ی لە هونەردا گرتبوو ۰ کریج سەری لە موسکۆدا و لە ۱۹۱۲دا لەسەر خواستی ستانسلاڤسکی ( هاملت )ی پێش‌کەش‌کرد ، لەگەڵ هەموو دۆستایەتی‌ی هەردوو لا ستانسلاڤسکی سەری بۆ بیروڕا ( ئەوپەڕ )ەکانی کریج دانەنەواندو لەسەر ڕێبازی سەربەخۆی خۆی مایەوە لە ماوەی ٤۰ ساڵ کار لە شانۆی موسکۆدا ۰

## نیکۆلای یفرینۆف :

یەکەم بەرهەڵستی ستانسلاڤسکی شانۆیی نووسێکی تازە پێگەیشتووی سەرەتای ئەم سەدەیە بوو کە ناوی نیکۆلای یفرینۆفە ( ۱۸۷۹ــ۱۹۵۳ ) و لە ساڵی ۱۹۲٥ەوە لە وڵات دەربەدەربوو ، ئەم نووسەرەی کە کارەکانی بە وێنەی کورت کورت بەناوبانگە لەپاش شەڕی

یەکەمی جیهان شـــانۆیەکی گاڵتەجاڕی پێکەنیناوی دامەزراندو نـــاوی‌نا ( ژنی تێکشێواو ) ( ناشیرین ) ٠ یەفرینۆفێك کـــە بەربەرەکانی ( سروشتایەتی )ی ستانسلاڤسکی دەکرد گاڵتەی بە شـــانۆی ( دیوای چوارەم ) کرد لـــە شانۆییەکدا ساڵی ١٩١٥ بەو ناوە خۆیەوە نیشانی‌دا کە پاڵەوانی شانۆییەکە ( نوێنەرێك )بوو دەبوو دەوری فاوست یاری‌بکات ، شەو لە شانۆدا مایەوە تاکو بەتەواوی بچێتە ناو کەولی دەورەکەوە ئیتـــر پـــاش چەندوچوون‌و کێشـــەی دەروونی‌و دیمەن‌ئاسایی شانۆییەکە دەگاتە کۆتـایی کەوا دیوارێکی چوارەمی بەڕاســـتی دروست دەبێت‌و ( مەثل )ەکە لـــە تەماشاکەران جودادەکاتەوە ٠

یەفرینۆف لـــــە پەلاماردانی سروشتایەتی‌و رەمزیـەت‌و پەیڕەوکردنی بنەڕەتەکانی شـــانۆیەتی شـــانۆ شلی‌نەدەکرد ٠ زۆریش لـــــە بیری بیراندیللو ، بلۆك‌و وایڵد نزیك بوەوە کە لەو باوەڕەدا بوو کە سەرچاوەی هونـەر ژیان نی‌یە بـەڵکو کارەکە پێچەوانەیە ، هەرچی سروشتەوواقیعە خۆیان نموونە لە کارە هونـــــەری‌یەکان وەردەگرن ٠ یەفرینۆف لای وابـــوو کە واقیعیەت‌و رەمزییەت کاکڵ یان گەوهەری هونەری شانۆیی لەناودەبەن کە سیفەتی بنچینەیی مەجازی‌یەکی رووتی دوور لـــە هەموو تەئسیرێکی لاوەکی‌یـــە ، هەروەهـــا دەشی‌گوت شانۆ نە مزگەوتەو نـــــە قوتابخانەیە و نە مینبەرەو نە ژنە بەڵکو شانۆیەو شانۆیەکی پەتی ، هەر بۆیـــە داواکاری شانۆیەکی ( پەتی ) بوو یاخۆ بڵێین ( بەشانۆکردنی ) شانۆ ئەمـــەش لەسەر بناغەی ئـــەوەی کە ناوی‌نابوو ئارەزووی سەرەتایی شانۆپەروەری کـــە لە هەموو مرۆڤێکداو کۆمەڵە خەڵکێکداو تەنانەت لە گیانەوەرانیش‌دا هەیە ٠

## ئەلەکسەندەر تـایرۆف (١٨٨٥ــ١٩٥٠)و شانۆی کامیرالی :

تایەرۆفیش لە یەفرینۆف نزیکتربوو ( مەثل )و دەرهێنەر بوو بە یەکە دوژمنی سروشتایەتی‌و یەکە پاڵپشتی شانۆی پەتی دەژمێردرا ، لەسەر ڕێ‌وشوێنی بیـــرو لێکدانەوەکانی کریج بە بێزەوە ســـەیری ئـــەدەبی دەکـــردو لای‌وابـــوو ئەدەب کەرەستەیێـــکی پێشنیارکراوی

بـــــەردەم دەرهێنـــــــەرە ، زۆرتریش
بایـــەخیدا بـــــە بزووتنـــەوە ،
ئیقاع ، بانتومیمو بالێ · لای وابوو کـە
کاری دەرهێنەر ئەوەیە نووسەری شانۆیی
دووربخاتەوەو کارێکی سەربەخۆ و نوێ
دروستبکاتو پێشکەشیبکات · چاکترین
نموونەی بیروراکانی تایرۆف لـەبارەی
سەربەخۆیی دەرهێنەرەوە ئەو پێشاننامەیە
بوو کە سالی ١٩٣٥ لە کاتی میهرەجانی
موسکۆ پێشکەشیکرد بەناوی ( شەوەکانی
میصرییانە ) ، ئەم پێشاننامەیەشی بـۆ
شەخسیەتی کلیۆپاترا تەرخانکردبوو کە
لە نووسینەکانی شکسپیرو پوشکینو شـۆ
بە ئیلهام وەریگرتبوو · هەنـــــدێ
رەخنەگر بۆ ئەوە چــــوون کە بیری
پێشکەشکردنی پیشاننامەیەك کە لـــە
نوومینی چــــەند نووســــەرێکەوە
هەڵێنجرابێتو کۆکرابێتەوە کارێـــکە
دەگەرێتەوە سەر رەووشتی کۆمیدیـــا
نوسانی رۆمانی کۆن ئەوانیش چـــەند
بەرهەمێکی یۆنانییان لە کارێکی شانوییدا
دادەرشت ·

لە ســالانی ١٩١٥ـ١٩٢٠ تایرۆف
کێتبێکی نووسی بەناوی ( چەند سرنجێکی
دەرهێنەرێك ) ، هـــەرچی بیروباوەری
خـــۆی هـــەیە دەربارەی « شـــانۆی
پەتی » هەمووی تێدا باسکرد ، لەگـەڵ
ئەوەشدا کە دوژمنایەتیی شـــــانۆی
ستانسلافسکی دەکرد بەلام لـــــــە
نوختەیەکدا لەگەڵیدا رێكدەکەوت ئەویش
دەربارەی بایەخی یەکەمی ( ممثل )ە ،
کە بە پێچەوانەی بیروراکانی ( کریچ )
بوو · نەختێك پیش شـــەری یەکەمی
جیهانی تایرۆف ( شانۆی رزگاریکەر )ی
لە موسکۆ دامەزراند لە سالی ١٩١٤شدا
( شانۆی کامێرالی ) بـــەلام رۆژگاری
شەر ماوەی نەدا لەســـــەر چالاکیی
تاقیکردنەوەکانی خۆی بەردەوام بێت ·
پاشانیش لەگەڵ رۆژگارە تـــازەکانی
شۆرشدا رێكنەکەوت ، بەتایبەتی کـــە
بەرنامەی کارەکانی بریتیبوو لـــــە
پیشاندانی بەرهەمەکانی هۆفمـــان ،
وایلد ، شۆ ، جسترتونو کلۆدیل لەگەڵ
رێبازو خواستی کاربەدەستانی شۆرشگێر
لــە ئەهلی شانۆ نەدەگونجا ، تایرۆف
ویستی چارەیەك بۆ ئەمە بدۆزێتـەوەو
چەند بەرهەمێکی وا پێشکەش بکات کـە
لەگـــەڵ شـــەپۆلە خورەکەدا رێبکاتو

وەکو پیشاندانی ( جاندارکی قەدیسە )ی دژ بە کلێسە ، یـــان پێشکەشکردنی بەرهەمەکانی یوجین ئونیل کە باســـی تەنگوچەڵەمەی شارستانێتیی رۆژئــاوا دەکەن ، بـــەڵام ئـــەم هــەوڵی خۆنزیککردنەوەیەش لە پەنجەی گومــان بەلاوەی نەنا و شانۆکەی لە هەڵوەشــان رزگارنەکرد ۰

## فسیفولود میرهولد (١٨٧٤ـ١٩٤٠)

هەر لەنـــاو بەرەی دوژمنداریی شانۆی ستانسلافسکیدا میرهۆڵد هەبوو کە لە هەمووان ڕەسەنتر بوو ئەم میرهۆڵدە لە خێزانێکی ئەڵمانی هەڵکەوتووە کە لـــە قەراغی دەریای بـــەڵتیق دادەنیشتنو پیشەیان تەمسیل بوو ، لـــە سەرەتای سەدەکەدا قوتابییەك بوو لە قوتابییەکانی ستانسلاڤسکیو لە شانۆی ئـــەودا پێگەیشتو زوو بە زوو کەوتە ژێـــر تەئسیری مامۆستاکەی ەکـــەوتە ئـــەوە شـــانۆیی ئەوروپایی کۆنو نـــوێ. پێشکەشبکات ئەوەبوو ساڵی ١٩٠٦ چەند شانۆیییەکی رەمزییەکانی پێشکەشکرد بـــە تایبەتی هینەکانی مەترلینکث ( وەکـــو موعجیزەی قـــەدیس ئەنطـــوان ) ، کارەکانی ابسن ، ئەندرییف و بلوك ۰ هەر ئەوسا بیروڕای خـــۆی دەربارەی لاسایینەکردنەوەی واقیعو رەمزدانـەوەی واقیع بڵاوکردبووەوە ، چەند ئۆپەرایەکو کـــارو فەنتازییەکانی هۆفمانی لە شانۆ پێشکەشکرد ۰ میرهـــۆلد لە رۆژانی ماوەی شۆرشدا بەوە ناویدەرکرد کـــە دامەزرێنەری ( ئەکتۆبەری شانۆیی )یـــە واتا ئەو شـــانۆیەی لەگەڵ بیروڕاکانی شورشدا شان بەشان دەڕواتو لـــە داموودەستووری شانۆی برجوازیی پێشـی شۆرش دابڕاوە ۰ بنچینەی سەرهەڵدانی میرهۆڵد ئەوە بوو مادام کە بزوێنـــەری کاروبارو رووداو چینی کرێکاری بـــە پیشەسازیو تەکنیکەوە بەستراوە ، ئیتر دەبێ شانۆ نەك هەر بە ناوەرۆك بەڵکـو بە شێوەکەشیەوە مل بۆ ئەم بیروڕایـــە رابکێشێت ، دەبێ پیشاندانیش بـــە رێگایـــەکی ژیریکراوو ( معقلن ) میکانیکانە پێشکەشبکرێت ۰ ئیتر بـەم جۆرە شانۆیەك پەیدابوو پێیانگـــوت ( البنائیة ) کە وا دادەنرا ( مەکینـەی بەجێهێنانی تەمسیلێکە کە کاکڵەکەی بوو بە بیومیکانیا ) بۆیە میرهۆڵد رەگەزی

پلاستیکی‌ی جوانی لە شانۆ قەدەغە کـــرد لە جیاتی ئەمە رژێمێکی تری بەکارهێنـــا کە بریتی‌یە لە چەند پەیژەو رووتەختەو پردێك کە یارمەتی ( ممثل ) دەدەن بـــۆ دەورگێڕانو یارمـــــەتی‌ی دەرهێنەریش دەدەن بـــۆ هەمەجۆرکردنی چارەسازی‌ی تایبەت بە هەڵوێستەکان ، ســـــەرباری ئەمەش پەردەیەکی تری لەرووی پشتەوەی تەختەی شانۆ بەخۆی‌و بـــە جێ‌کارەکەی‌و کەلوپەلەکانی‌یەوە هـــەڵدایەوە • ئـــەم ( مەکینەی تەمسیلە )ش جگە لە ( ممثل ) هیچ کەسی تری تێدا نەبوو ، ئەمـــــەش کارێکە مانــــــای ( شانۆی دینامیکی )ی کریچمان دەخاتەوە یاد •

لە ڕاستیشدا ئـــــــەم بیومیکانیکایە لەسەر ممثلی‌پێویست کرد کە دەبێ لەش‌و لارێکی ئێجگار لێ‌هاتووی هەبێت‌و دەوری ئەو هیچی لەبەر دەوری ئەکرۆپاتیکیك‌دا نەبێت • لێکۆڵەرەوەکان سەیریان‌کرد کـــە بیومیکانیکا هەوڵدانێك روون‌دەکاتەوە بۆ زاڵبوون بەسەر بەرچاوتاریکی‌ی کریچ‌دا کەوا باوەڕی بە تواناو هێزی ( ممثل ) نەبوو بتوانێ ئەرکەکانی فەنتازیاکردنی شانۆیی راپەڕیوی پێ‌جێ‌بەجێ‌بگرێت •

میرهۆلد هەروەهـــــــا دروشمی ( کاری بەکۆمەڵی مومەسیلانی هۆشیاری سیاسی‌و لە خزمەتی شۆرشدا )ی هەڵگردو هەوڵی‌دا کـــــە شـــــانۆ پێشاندان ســـــروشتی کۆبوونەوەیەکی سیاسی‌و بزوانـــــــدن‌و هاندان وەربگرێت بەو ئامانجە کە لەگەڵ رابردوو بجەنگێت‌و بەواقیعی نـــــــوێ هەڵبلێ ،لەئەنجامی ئەمەدا پێویست وابوو کە بە گەلێ شێوەی ، دوور لـــــــــە ( سروشـــــــتایەتی )و ئارەزوومەندیی نووساو بـــــــە شێوەی ستانسلافسکی ، پەلاماری تەماشاکەر بدات بە مەبەستی سڵەماندنەوەی تەماشاکەرو دروست‌کردنی رایەڵێك لە نێوان تەختەو هۆڵدا لەکاتێکدا ستانسلافسکی لە نێوانیاندا ( دیـــــواری چوارەم )ی دادەنا • هەروەها میرهۆلد لە رێبازی ( شکل‌پەروەری )ی تایروف و دوورەپەرێزی‌ی لــــــــە سیاسەتـــــــدا خۆی‌بەدوورگرت •

شانۆی میرهۆلد کــــــــە ۳ شانۆییە بەناوبانگەکانی ماياکۆفسکی ( مستزیوم بوفو ) سالی ۱۹۲۱و ( مۆرانە ) سالی ۱۹۲۹و ( کۆتران ) ســـــــالی ۱۹۳۰ی پێش‌کەش‌کرد خزمەتی بـــــە بیروڕاکانی

شۆرش گەیاند ، بەڵام لەگەڵ ئـــــەو سەرکەوتن‌و پەسندکردنی خەڵکە لـــە سەرەتادا ، وە دان‌نانی دەوڵەت بـــە شانۆکەو لەگەڵ ووردی‌و کارزانیشیدا لە بواری بیومیکانیکا دا دیســـــان کارە نوێ‌کردنەوەییەکە نەکەوتە بــــەردڵی تەماشاکەران‌و کاربەدەستانیش ، بەڵکــو بەپێچەوانەوە ، لێی دردۆنگ بوون‌و بە تیژییش رەخنەی لێ‌دەگیرا ، بێ‌گومــان لەوە رەخنەی لێ‌نەدەگیرا کە رابردووی تاوانبار دەکرد بەڵکو لەبەرئەوە کـــە نموونەی رەووشت‌کردی نوێی ئیجـــابی دروست نەدەکردو پیشاندانەکانی لـــە کردەوە شۆرشگێری‌یەکانی ( بەپێی مانای ئەوسا ) بێ‌بەش‌بوون · لە ئەنجامیشدا بە شکل‌پەروەری‌ی کوزموپولیتی‌و تەنانـــەت بە دوژمنایەتی کردنی شۆرشیش گومانبار کرا · لە ساڵی ١٩٣٨ بــــە بڕیارێکی دەوڵەتی ئەم شانۆیە دەرگای داخرا کە لە راستیدا هاوشانی شەپۆلی شـــۆرشگێری پێ‌گەیشت ، لە دواییشـــــدا دوارۆژی میرهـــۆلد بێکاری‌و ئنجا دەستبەسەری‌و گرتن لە یەکێك لـــــە سەربازگاکاندا تامردن ، لەم وەختەدا دەوری شانۆیەکی نموونەیی تر بـــــۆ ماوەی ئارامگیری هاتەپێشەوە کە شانۆی ئەکادیمی‌یە ·

بیروڕاو بەرهەمەکانی میرهۆلد بــە رەغمی هەموو شتێك بوون بـــــــە دەستکەوتێکی گەورەی شانۆ و بوون بــە هۆی بە پیت‌و بڕشت‌کردنی چالاکی‌یەکانی لەمەولای بیسکاتورو بریخت‌و ئەوانی تر کە کۆمەڵ کۆمەڵ شــــــانۆی سیاسییان پێکەوەنا ·

## یوجین فاختانجوف

فاختانجوف (١٨٨٣–١٩٢٢) هەوڵی‌دا دروشمەکانی ستانسلافسکی‌و میرهۆلد لــە بۆتەیەکدا بتوێنێتەوە ، کە خۆی بە گیانی شانۆی هونەری‌ی موسکۆ پەروەردە ببــوو ئاگاداری دەستکەوتەکانی شـــــــانۆی رۆژاوایش بوو ، ئەگەرچی بە لاوی مرد بەڵام ئەو شانۆیەی دەیخواست بوو بـــە نوقڵانەی پەیدابوونی کۆمەڵە شانۆییەکی نوێ ، لە ساڵەکانی بیستدا بـــــوو کە شێوازی شانۆییانەی فاختانجوف پێ‌گەیشت کە ناوی نرا « واقیعیەتی فەنتازیایی » کە داڕشتنی هەردوو دژ دەگەیەنێ واتــا ستانسلافسکی‌و میرهۆلد ·

## پێشخەرەکانی ئەڵمان
## ماکس راینهاردت ( ١٨٧٣ـ١٩٤٣ )

راینهاردت کارگوزارێکی شانۆیی فرەبەهرە بوو ، لێرەدا قسەیەك هەیە دەڵێ .. کاری تەواوی ئەو پیاوە بریتیبوو لە کرداری یەکتربڕینی واقیعیەتو هاودژەکەی ، کە بەڕێوەبەری شانۆی ( دویتشە تیاتر )ی بەرلین بوو ( لە ساڵی ١٩٠٥ەوە ) پیشانیدا بێ گومان کە پیاوێکی بەگوڕی سەرسامکەرە ، هەر بەم جۆرە لە دەرەوەی بەرلینو وولاتیشدا ( لە ساڵانی ١٩٢٧ ـ ١٩٢٨ )دا کەوتە بزاوت ، ئەوەبوو گەشتێکی شانۆیيانەی بۆ وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کرد ، ئەوەی لێی زانراوە ئەوەیە کە تەئسیری ، هەموو لایەکی وەرگرتووەو ئەگەرچی ناکۆکو دژ بە یەکیش بووبن ئەو لە بۆتەقەی بەرهەمێکی تازەدا دایڕشتوون بەڵێ ، نوسەر نەما ، شێوە نوسین یان جۆری دراما نەما راینهاردت وەگیری نەهێنێ .. شێوەی ( سروشتایەتی )و ( تەقلیدی )و هی تری بەکارهێنا بەڵام مەسەلەی پێشکەشکردنێکی ووردو ڕێکی لە بیر نەدەچوو . لە ساڵانی بیستەکاندا بیروڕاکانی پێشڕەو ( طلیعة ) کاری تێکردو پەنای بۆ ساکاریکردن و دابەشکردنی تەختەی شانۆ و خانووی چەند نهۆمی برد ، ناوبانگەکەی لە ئەنجامی پیشاندانی دیمەنی بەکۆمەڵی وابوو کە بە شێوەیەکی تەعبیریانە پێکدەهێنرانو دەرهێنەرانی تر لاساییان دەکردەوە ، لە پیشاندانا دەیویست مێشکی تەماشاکەر ڕابکێشێتو بەهۆی تەمسیلی چاکی ممثلانی ناسراوو رازاندنەوەی تەشکیلی یان پانوپۆڕی شانۆکە خۆی تەماشاکەر بووروژێنێ . نموونەی ئەمە ( شانۆی مەیدان ـ مسرح الحلبة ) بوو کە ساڵی ١٩١٩ لە مەیدانی سێرکی بەرلین ڕێکیخست . کە لە مەیدانەکەدا شانۆیەکی دروستکرد پانیی ٢٠ مەتر بوو ، پەردەکەشی بازنەییو بەسەر چەرخێکی گەورە چەسپکرابوو ، جا وەکو سەیردەکرێت ئەم شانۆیە وەکو شێوەیەکی خوازراوەی شانۆی ئەغریقی بێت وابوو کە لەتەختەو ئورکسترا پێکدەهات . هۆڵەکەش پێنج هەزار کەسی دەگرتو لەمەوە ناویان لێنا شانۆی ( پێنج

هەزارە ) پرۆگرامەکەشی شانۆییەکـانی شەکسبیر بوو کە « هاملت » سەردەستەیان بوو ئەمانەشی لـە دوای شەڕی یەکەمی جیهانو بەزینی ئەلمانیا پێشکەشکرد لـە کاتێکدا کە باری کۆمەڵایەتیو گوزەرانی گشتی شڵەقابوو ، شانۆکە گەرم نەدەکراو ( ممثل )ەکان بە قاپووتی عەسکەرییەوە دەوریان دەگێڕا · لێرە راینهاردت بیری ئەوەی بۆهات کە هاملتی ئەلمانی لە ساڵی ١٩١٩دا پێشکەشبکات ، هەر ئەم فیکرەیە چەند دەرهێنەرێکی تریش وەریانگرت ، یەکێك لەوان تادیوش کانتوری پۆڵەندی کە شانۆییەکی ڤسبیانسکی هاوولاتیی خۆی بەناوی ( گەڕانەوەی یولسیس ) ساڵی ١٩٤٦ بەم جۆرە پیشاندا ·

کۆشەیەکی تری چالاکیی راینهاردت ، بریتی بوو لـە بەشداربوونی لـە میهرەجانەکانی سالسبورگی نەمسا ، ئەم میهرەجانانەش تا رادەیەکی گـەورە دەشوبهێتە میهرەجانی سینمایی ( کان )ی ئەمڕۆ لەبـەر دروشمی بازرگانی ـ هونەرییەکەی · ئەم مێهرەجانانەش لـە شوێنی سەروالای وەکوو حەوشەی بەردەم کاتدرائیەی شارەکە دەکـرا · ئەمەش کۆششێکی ئاشکرا بـوو بـۆ زیندووکردنەوەی شانۆی دینیی کـۆن ، هەروەها هەندێ شـانۆیی ئەغریقی پێشکەشکرا کە نووسەرێکی ئەلمـانی هاوچەرخانە گۆڕیبووی ، جگە لەمـەش راینهاردت شانۆییەکی شـێوە هێمایی ( ایمائی ) ناوەرۆك ئایینی بەنـاوی ( معجزە )وە پێشکەشکرد کـە سینارێستەکەی کارل فولیلری ئەلمانی بوو ئەم شانۆییەش لە ئەوروپاو دواجار لـە لەندەنو نیویۆرك کە پێشکەش کـرا ناوبانگێکی زۆری پەیداکرد ·

پاش وەرگەڕانەکەی هیتلەر راینهاردت تووشی راونان هات ، ناچار بوو وولات بەجێبهێڵێ · لە پاریس ، ساڵی ١٩٣٣ پێشنیاریان بۆکـرد کـە ئۆپەرای « شەمشەمـە کـوێرە »ی شتراوس پێشکەشبکات ، کە وەختی خۆی سـاڵی ١٩٢٩ لـە بەرلین پێشکەشی کردبوو · ئەویش لـە شێوەی نمایشێکی گەورەدا بە هاوکاریی باڵێو لەسـەر تەختەیەکی بازنەیی هەمیشە لە جووڵانەوە هـاتووی سەراوسەرو تیاوتی پێشکەشیکرد ·

## ئیرنین بسکاتور ۱۸۹۳ ـ ۱۹٦٦

بسکاتوری شانۆکەری ئەلمانی بە دروستکەری شانۆی ناودار بە سیاسی دەژمێردرێت • سەرگەرمی شۆرشی ئەکتۆبەر بوو ، بە هۆی ئەمەوە داوایکرد کە شانۆ با بۆ خزمەتی بانگاشە بۆ شۆرش بەکاربهێنرێتو بەو شێوەیەی کە شانۆی ( ئەکتۆبەری شانۆیی) رووسی دەیکرد ، لە سالی ۱۹۲٤دا دەستی بەکارکرد • گەلێ شانۆی بەرێوە برد ، یەکێکیان ئەو شانۆیەی کە بە ناوی خۆی بوو (۱۹۲٦) • هۆلی ئەم شانۆیەش کرابوو بە دوو بەشی هاوشانی یەك بەپێی جودایی چینایەتی ، لای چەپ خەلکی برجوازیو لای راستیش پرۆلیتاریا تێدا دادەنیشت •

بێگومان بسکاتور شانۆیی هاوچەرخی پێشکەش دەکرد • هەروەها دەستیدا بەرهەمهێنانی سیناریۆی شانۆبابەت ( یەکێکیان دەربارەی شۆرشی ئەکتۆبەر بوو ) و بە کەرەستەی فیلیم پری دەکردنەوە ، چەند ریوایەتێکیشی بردە سەر شانۆ وەکو ریوایەتی « شەرو ئاشتی » کەوا تا ئەمرۆش هەر پێشکەش دەکرێت • هەروەکو چۆن رانیهاردت (هاملت)ی لە قالبێکی تازەدا دەرهێنا ئەویش (دزەکان)ی شیلەری لە جلوبەرگێکی نوێدا پێشکەشکرد ، وەکو زانراوە سیناریۆکانی پێشتر لە ستۆدیۆی دراماتوجی بە ووردی ئامادە دەکران • ئەم ستۆدیۆیە تابلۆی تەرکیبی وای ئامادە دەکرد کە لە میسالی جووتکردنو بەیەکبەستنەوەی دیاردە جۆر بە جۆرەکانی سیاسیو کۆمەلایەتی وایە •

لەگەل ئەوەشدا کە دروشمی ( شانۆیەکی سیاسی ) هەلگرتبوو ، دەیزانی کە مایەی سەرکەوتنی شانۆ تا رادەیەکی زۆر بەو توواناى گەیاندنەوە بەندە کە بێگومان بە شێوازی ئاشکراییو راستەوخۆیی پێکنایەت •

گوتوویەتی : ( شانۆ پێویستی بەو شتە هەیە کە شانۆییە ئیتر ئەوسا مافی ئەوەی هەیە کە ببێ بەهۆیەکی شارەزایانەی پروپاگەندە ) • ئەم بیروڕایەش ، لێکدانەوەکەی مایۆکۆڤسکیمان بیردەخاتەوە کە داوای دەکرد شیعری شۆرشگێرانە دەبێ بەر لە

هەموو شتێك شیعر بێت ئنجا ئەو ئەرکە بەجێبگەیەنێت کە هونەرێکی ماندەرە٠جا بۆ بەجێهێنانی شانۆیەکی پروپاگەندەیی بسکاتور گـەلێ شێوازی شانۆیانـەی پێشـکەوتوو بەتایبەتی ماکینـەیی جوارجۆری بەکار دەهێنا ، ئەمەش لەلایەن پارەوە گران دەوەستا بۆیە ئەم شـانۆ پێشڕەوە تووشی دەستکورتیو هەژاری هات ، ساڵی ١٩٣٣یش کە ئەلمانیا بوو بە فاشی بەجێیهێشتو رووی‌کردە یەکێتی سۆڤیەتی ، پاشان چووە پاریسو لـە دواییدا لـە وولاتە یەکگرتووەکـان ئارامیگرت ٠

پاش شەڕی گەورە هاتەوە بەرلینی رۆژاوا کـەوا ساڵی ١٩٦٢ بوو بـە بەڕێوەبەری شانۆیەك لـە شانۆیەکانی ئەوێ ٠ بسکاتور لە رۆژگـارێ نوێیدا هەر بە دلسۆزی دروشمی ( شـانۆی سیاسی ) مایەوەو لـە پرۆگرامەکانیدا شانۆییەکانی پێشڕەوی پێشکەوتنخوازی کۆنو نوێی پیشاندەدا ٠ هەروەها هەوڵو کۆششی کـۆنیشی نوێکـردەوە بـۆ بەکارهێنانی تەکنیکی بەرزو شـێوەی شانۆیی زادەی کەرەستەی هونەرەکـانی ترو کەرەستەی دیکەی وەکـو فیلمو نیگارو تەلفزیون ٠٠

## برتولت بریخت ١٨٩٨ ـ ١٩٥٦

لە ساڵانی بیستدا بریخت هاریکاری لەگـەڵ بسکاتوردا کـردو شانۆییەکی پێشکەشکرد کـە لـە ریوایەتێـکی ناسراوی چیکی دژ بە شەڕی درهێنا بوو ٠ بریخت هەر لەسەر بیری (شانۆی سیاسی) رۆییشت بەلام بە شێوازی خۆی : ئەویش ساڵی ١٩٣٣ وەکو راینهاردتو بسکاتور وولاتی بەجێهێشت لەو کاتەدا کـە بە بەرچاوی خەڵـکەوە بەرهەمەکـانی سووتێنرا ٠ تا ساڵی ١٩٤٨ لە وولاتـە یەکگرتووەکان مایەوە ، لەوێدا چـەند شانۆییەکی دژ بـە هیتلـەرو هی دی نووسیو لەسـەر شانۆی زۆر وولاتان پیشاندران ٠ پاشـان بـە شیوعی گومانبارکرا ، لـەبەردەم لیژنـە بەناوبانگەکەی ماکـارتیدا وەستا ٠ بریخت لـە ماوەی بزاوتی هونەریدا ١٩١٨ ـ ١٩٥٣ زیاد لە ٣٠ شـانۆیی بلاوکردەوەو پیشانیدا ، بەناوبانگترینیان ( ئۆپەرای سێ فلوسەکەیە ١٩٢٨ کـە وێنەیەکی گاڵتەجاڕیی کۆمـەڵەیەکی

سوالـــکەرانی ئینگلیزەو ویستوویەتی بەهۆیەوە گاڵتە بە کۆمەڵی نوێ بکات کە لەسەر بناغـــەی چەوسانەوەی چینایەتی دامەزراوەو بـــە دنیـــای تاوانەوە پەیوەندیدارە · لە ساڵی ۱۹۲۳شـــــدا (دایکت)ی نووسی کە پاڵی بە چیرۆکـــە بەناوبانگەکـــەی گۆرکی دا ، پاشـــان ( ژیانی غالیلۆ ) ۱۹۳۷ ـ ۱۹۳۸ کـــە کێشەو ململانێی ئەو زانایەی پیشـــاندا لە پێناوی راستیدا لەگەڵ کاربەدەستانی کلێسەدا · لە ساڵی ۱۹۳۹شدا ( دایـــکە کۆراجو منداڵەکانی )ی پێشکـــەشکرد ئەمەش دەڵێی ڕستەی دەنگوباسی شەڕی سی ساڵەیە لەچاو ژنێکەوە کە ووردەواڵـــە فرۆشێکی دێوەرەیە هـــەرچی هەیەتیو کوڕەکانی هەمووی لەدەسچوو لەســـــەر ئەوەشەوە لە بەرامبـــەر چ زەبرێکدا هەرەسی نەبرد · ئـــەم شانۆییـــە تاوانداناپاڵێکی دراماتیکانەی گیـــانی سەربازانەو شەڕ بوو ·

لە ساڵی ۱۹٤۱ ـ ۱۹٤۲دا (هەڵکشانی ارتورو اوی ) پیشکـــەشکرد کـــە شانۆییەکی شێوە کاریـــکاتوری توندو تیژە دەربارەی فاشیەتی ئەلمـــــانیو سەردارەکەی ، کەسانی چیرۆکەکەش یەك بـــە یەك بەبێ هیچ ئاڵۆزییەك وێنـــە دانەوەی کاربەدەستانی سیاسی ئەلمانیـــا بوون لـــە سەردەمی نازیدا ·

ئەم شانۆییە بریتییە لەوە کـــە سەرەکێکی ئاواتفراوانی دەستە چەتەیەك بە فرووفێڵو بـــە زەبروزەنگ دەتوانێ دەستبەسەر مونوپۆلێکی سەوزەفرۆش دابگرێت · ژیانی ( ارتورواوی ) کتومت لـــە ژیانی هیتلەر دەکاتو وێنـــــەی هەردووکیان جووت دەبێت کاتێ کە باسی قۆناغەکانی پلانی دەسەڵات زەوتکـــردنی هیتلەر دەکات ، ئـــەم شانۆییە کـــە لە بەرلین پێشکەشکرا پەیکەری داری ئـــەم کەسانەی لـــــە چیرۆکەکەدان وەکـــو کاربەدەستان خۆیان لـــــە پێشـــــەکی پیشاندانی شانۆییەکە دانران · شانۆیی ( شفیك لـــــە رۆژگاری شەڕی دووەمی جهاندا ) ۱۹٤۲ ـ ۱۹٤۳ ئەویش لـــــە روایەتی یاروسلاف هاشیکی چیـــــکی وەریـــگرتووە · شـــانۆیی ( جغـــزی تەباشیرکردی قەوقاز )ی ۱۹٤٤ـ۱۹٤٥ لە ئەفسانەیەکی کۆنی چینی وەرگرتووە کە بریتییە لە کێشەی دوو ژنان لەســـــەر

مندالێك‌و لێره‌دا نووسه‌ر جۆری ره‌ووشتی ده‌ره‌به‌گایه‌تی ئه‌تك‌ده‌كا ٠

جموجوولی بریخت چاكترین نموونه‌ی ئه‌م رایه‌له‌ ئه‌ندام‌كرده‌یه‌ كه‌وا لـه‌ نێوان نووسینی شانۆبابه‌ت‌و خه‌لقی شانۆیی دایه‌ شانۆ له‌ زه‌مانی شه‌كسپیرو مولیێره‌وه‌ ذاتێكی تری وه‌كو بریختی نه‌دیوه‌ ، بریخت جگه‌ له‌ ئه‌ده‌ب ، له‌ شانۆشدا كاری ده‌كردو شانۆییه‌كانی خـۆی به‌ ده‌ستی خۆی ده‌رده‌هێنا ئه‌وه‌بوو پاش‌ئه‌وه‌ی لـه‌ مه‌نفا گه‌رایه‌وه‌ له‌گه‌ل (هیلین ڤایگل)ی ژنی شانۆی ( برلینر انسامبل ) ( تیپی به‌رلینی ) له‌ سالی ١٩٤٩ دامه‌زراند ٠ ئه‌م شانۆیه‌ دوای مردنیشی هـه‌ر له‌كار نه‌كـه‌وت ٠ هونه‌رمـه‌ندان‌و ئه‌وانه‌ی به‌رده‌ستییان ده‌كرد هـه‌ر له‌سه‌ر شێوه‌ی تایبـه‌تی خـۆی كـاری خـۆیان به‌جێ‌ده‌گه‌یاند ٠

بریخت كـه‌ ماركسی‌و ماتریالستێكه‌ كۆششی‌كـرد تا لـه‌ ئـاره‌زووی جوانی‌په‌روه‌ری ، كۆنه‌ جادوو ، شـانۆ رزگاربـكات‌و بیكا بـه‌ هونه‌رێـكی كۆمه‌لایه‌تی‌ی ژیرانه‌ی خاوه‌ن رێبازێكی په‌روه‌رده‌یی پـه‌تی وا كـه‌ بیرورای پێشكه‌وتن‌خـواز بـۆ ته‌ماشاكـه‌ر رووت‌بـكاته‌وه‌و هوشیاری‌یه‌كـه‌ی بوزووژێنێ به‌ره‌و رامان‌و بیركردنه‌وه‌ رای‌بكێشێت ٠ ناوه‌رۆكی شانۆییه‌كانی بریخت تایبه‌تی‌یه‌ بـه‌ بزووتنـه‌وه‌ی مرۆڤێك له‌ ناوه‌نده‌ ژینێكی دیاری‌كراودا ده‌ژیت‌و ناكۆكی‌یه‌كانی خۆی به‌كۆله‌وه‌یه‌ بریختیش به‌پێی بیرورای بیسـكاتور پروپاگه‌نده‌ی راسته‌وخۆو ئاشـكرایی بێ‌تام‌و سـاده‌ی به‌لاوه‌نا و ملی‌دایـه‌ به‌راووردكردن ٠ به‌راووردكردنه‌كـه‌ مایه‌ی به‌ئاگاهێنان‌و بزواندنی حـه‌زو سه‌رسامی‌یه‌تی ٠

بریخت كه‌ره‌سته‌ دراماتورجیه‌كانی خۆی له‌گه‌لێ سه‌رچاوه‌وه‌ وه‌رگرتووه‌ ٠ لـه‌ ئه‌ده‌بی نووسراوو سه‌رزمـان‌و چ كاتێكیش ئه‌و سه‌رچاوانه‌ی نه‌ده‌شارده‌وه‌ كـه‌ شتی لێ‌ده‌خوازتن ٠ كه‌ بابه‌ته‌كانی خۆشی داده‌رشته‌وه‌ هه‌ولی‌ده‌دا كـه‌ لـه‌ رووی ( شـعری ئه‌رستۆیی ) بووه‌ستێ ئه‌مه‌ش به‌ په‌نابردنه‌ به‌ر شعری سه‌ده‌كانی ناوه‌راست یان كه‌ پێی‌ده‌لێن شـانۆی داستانی « المسرح الملحمي » كه‌ بریتی‌یه‌ لـه‌ گێرانـه‌وه‌ی چیرۆكێك نـه‌ك

پیشاندانی کێشەوبەرەیەکی توندوتیژی دراماییانە ، جــا ئەم جــۆرە داستانە شانۆییانەش پەیکەرێکی فشوفۆڵی وایان دەبێت کە ماوە دەدەن بابەتەکە (موضوع) لێك بکێشنەوەو ناچـاری خەستکردنەوە نەبن بەپێی کاتو خواستی جـارانی درامای کون بریخت لای وایــە بۆئەوەی تەماشاکەر لــە حالی وورياییو کرژی دابێت نابێ هـــەر خەمی فێرکردنیمان لەبەربێت بەتەنیـــــا بەڵـــکو دەبێ دڵخۆشکردنیشی لەبیرنەکەین ، بۆیــە لــە شانۆیی‌یەکانی‌دا بایەخی بەگاڵتــەو پێکەنینو کاریـــکاتۆرو گۆرانی ، یان مۆسیقا دەدا ٠ ئامانجی بریخت لــــــە نوسینو بەجێهێنانی شانۆیی ئەوەبوو کــە بابەتو ڕووداوو هەڵوێستەکــان بگوێزرێنەوەو لە دووری‌یەکی زیاتر لــە دووریی راستی دیاربکرێن کە ببێتە مایەی پێشوازی‌کردنێکی جیـــاواز لـــــە پێشوازی‌کردنی ئەم شتانە لەژیاندا ٠ لە هەموو جارێکی پێشاندانیشدا هەموو ئەم هەوێنانە بۆ سەرسام‌کردنی تەماشاکــەر بەکار دەهێنران لە چوارچێوەی داهێنانو جێبەجێ‌کردنێـکی ووردی شارەزایانەدا کـــە لەگـــەڵ (سروشت)دا تەنیـــا پەیوەندی‌یەکی رووکەشانەی دەبوو ٠ لە راستیشدا هــەر ئەم سروشتە بوو کـــە دەورێکی کاریگەری هەبوو بۆ چەسپاندنی گیانی شانۆیی لە شانۆی داستانی‌دا ( کــە بە چـــاوی کلاسیکیەوە سەیری‌کـــەیت شانۆیی‌یەکی نا دراماتیکی‌یە ) ئەگـــــەر ئەوەی نەبوایە چـــۆن ئەو وێنـــــە شاش‌وبێشانەو نەبوونی دینامیـــــکی‌ی درامایی دەیان توانی کاری شانۆیی‌یەکی تەواو سازبکەن ٠ لێرەدا دەڵێین دیدرۆ جارێکیان ڕووداوی تراجیدی لە روایەتی عاتیفی جیاکردەوە و گوتویەتی ئینتیباع یان کـــارکردنی ڕووداو لەناکـــــاوو کتوپڕدەبێت کــەچی روایەت جـــۆرە ڕەوتێکی رەوانو بەکاوەخۆی هـــەیە ٠ ئەگـــەر هەڵوێستە تاکییەکانی بریخت بەلاوەبنێین دەبینین پەیوەندیی بــــە بسکاتور یان کریج ( لـــە چوارچیوەی میرهولدەوە ) شتیـــکی بێ‌گومـــانە ٠ هەروەها کەوتنـــە بەر کاری عقلانیەتی دریدۆشی شتێکی زانراوە ٠ لەوانەشە لە ئەنجامی ئەم کارتێ‌کردنە جووت‌سەرەوە بێ کـــە ناوبانگو سەرکەوتنی بریخت خێرا پی‌گەییشتو بڵاوبووەوە ٠

## پێشخەرەکانی فەرەنسە

**ـ جاك كوبو (١٨٧٩ ـ ١٩٤٩) :**

کوبو لـــە ساڵی ١٩١٣ شانۆکەی دامەزراندو کارێکی زۆریکردە ســەر ئەوەیەك یاریکەرو دەرهێنەران دەربارەی پاراستنی ڕێوشوێنەکـــانی شانۆیەکی سەربەخۆی هونەر روخسار ٠ لە ســاڵی ١٩٢٤ەوە پرۆگرامێـــکی بەپێـــزی پێشکەشکرد هــــەر لە شەکسپیرەوە بیگرە تاگۆکۆلی تێدابوو ، هەروەهـــا شانۆییەکـــانی کلاسیکیی فەرەنسیشی بەتایبـــەتی هینەکـــانی مۆلییری پێشکەشکرد کە دەیویست سروشتەکانی ئسلوبی نەتەوەیی شـــانۆ لای ئـــەو بدۆزێتەوە ٠٠ کۆبو بە رادەی یەکـــەم پشتی بە دەورگێڕانی ( یاریکـــەر ) و گوڕو ووزەی تەعبیر لـــە تەفسیرەکانی دەقەکەو ڕێبازەکانی دەبەست ئەمەش لـــە چوارچێـــوەی شیکردنەوەی تەفصیلیدا هەروەها لـــە کاریگەریی تەشکیلی ( لە دیـــکۆر وئەکسسوار ) دووردەکەوتەوەو تەشکیلیکی سادەی وای بەسەردا پەعـــند دەکـــرد کـــە دەیویست بێ بـــە کەرەستەیەکی یارمەتیدەر نەوەکـــو

هاوبەشێکی بەهێزی پێشکەشکردن

**ئەنتونین ئەرتو (١٨٩٦ ـ ١٩٤٨)**

ئەرتو پێشخەرێك بوو تێکەیشتنەکانی شانۆیی بەلای شۆرشگێڕیدا برد ٠ خۆی یاریکەر (ممثل) بوو ، بەڵام ناوبانگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مەیدانی تیووریی ( شانۆی رەقی ـ مسرح القسوة ) ٠ لە ڕاستیشدا یەکەم کەس کە بانگی بۆ شانۆی رەقی دا ستراندبورگ بوو ســـەیری پێشەکیی شانۆییەکەی ـ جولی خـــان ـ ی ئـــەو بـــکەن ٠

لەمەش بەولاوە پێشتر ستراندبورگ داوای کردبوو کە تەختەی شانۆ نەمێنێتو زۆر بیروڕای وای خستە ڕوو کە ئەمڕۆ شانۆی تازە پەیڕەویاندەکات ٠ ئەرتوش ئاواتی ئەوەبوو کە بە تەواوی شـــانۆی کۆن برووخێنێو دەیویست شـــانۆی نوێ گیانلەبەری مرۆڤ وەهـــا پێشکەش بکات کە لە هەموو بەرگێکی شارستانی ڕووت بوو بێتەوە بەو پێیە کـــە ئـــەم بەرگانە هەموو ساختەو درۆن ٠ کـــەوابێ دەیویست وێنەیەکی ڕاستگۆیانەی ئـــەو هێزو هۆیە سەرەتاییە ڕزگارکـــەرانە پێشکەش بکات کە لە پێش دەرگـــای

ئاگـــــایی‌دا (وعی)مات بوون • ئەرتو هەروەها ( بە گونجاوی لەگەڵ گیـــــانی پێش‌خستن‌دا ) مەفهومی ئەدەبی لـــــە شانۆدا بەلاوەنا ، کەوا لە خستنەڕووی نائاگایی‌یەکان کـــە لە نێوان هـــۆی توندوتیژیی تەعبیرکردنەوە دەردەکەون هێزدەستێنێ • ئەویش بوو دەیگوت کـــە ئامـــانجی پێش‌کـــەش‌کردن ڕووداني هەژانێکی گەورەیە لە تەماشاکەردا •

ئەرتو لە ساڵی ١٩٣١دا کە لە پاریس هەندێ کردەوەی ئایینی گەلانی ئاسیای دیت ، نەزمە ئایینیەکانیان کاری‌تێ‌کرد ، تابلۆی پەسندی بیرو ڕاکانی ( الفریـد جارێ ) دەکرد ، کار گەیشتە رادەیەك کە ســـــاڵی ١٩٢٦ شانۆیەکی بچـــووکی دامەزراندو ناوی نا « جارێ » ، نووسەری پەسندی ئەم شـــــانۆیەش ( فیتراك )ی سوریالی بوو کە بە باوکی ئـــــــەو دراماتورجیایە دادەنرێت کە لـــەمەودوا ( یۆنسکۆ ) نوقڵانەی پەیدابوونی دا • جگە لەمە ساڵی ١٩٣٢ بـــە بسکاتور گەیشت ، بەڵام رێبـــــازی « شـــانۆی سیاسی » نەگرتەبـەر • هـــەر لـــەو ساڵەدا « مانفیست »ێکی دەربـــــارەی شانۆیی رەقی بڵاوکردەوە ، کەوا بـــــە شـــــێوەیەکی ئاشـــــکرا تێگەیشتنی ئەوپەڕگرتووی خۆی دەربارەی بنەڕەت‌و سروشتەکانی ئوســـــلوبەکەی خـــۆی روونکردوەتەوە• بەنموونە گوتوویەتی :

« ئـــــەو شانۆیەی ( پێش‌کەش‌کردن ) مل‌کەچی ( دەق ) دەکات ئەوە شـــانۆی شــــــێت ، سەرپەل ، سەوزەفرۆش ، زمانەوان ، ناشاعیرو براگماتی‌یەکانە • شانۆ پێویستە وێنەیەکی بەرجەســــتەی ووردی ئەو خەونانە بە تەماشاکەر بدات کـــــە ئارەزووی تاوان‌و سەراسایی‌و زەبروزەنگی جنسی‌و بۆچوونی تۆباوییانەی تەماشاکەر بەرامبەر ژیان‌و شتەکـانی‌و تەنانەت گۆشتی مرۆڤ ـ خۆرەکــــانیش دەربخەن ، ئەمەش نــــەك بەشێوەیەکی راستەقینەو راستگۆیانە بەڵکو وەکو ئـەو شتانەی کە یەکسەر لە دەروونی خۆیەوە هەڵدەکوڵن ( •• ) پێویستە شانۆ وەکو خەون خۆیناوی‌و نامـــــرۆڤانە بێت ، نموونەی کردەوەیی ئەم جۆرە شانۆیەش پێش‌کەش‌کردنی ( خێزانی سینتشی ) بوو کە لە چەند دەقێکی شیللی‌و ســـتندالەوە پێکی‌هێنابوون‌و ئەرتو خۆیشی دەری‌هێنا•

بەڵام ئـــەم پیشاندانەش سەرکەوتوو نەبوو ٠

**« کارتیل »ی جیهانی :**

لە ماوەی نێوان هەردوو شـەڕەکەدا شانۆی سەربەخۆی هونەری « کارتیـــلی پاریسی » لە کاردابوو کە لە چوار مخرج پێك‌هاتبوو کە بەیەکەوە کاریان‌دەکرد ئەمانیش ، دولین ، جۆڤێە ، باتیۆ بتویێف بوون ٠ دولینیـــان ( ١٨٨٥ـ١٩٤٩ ) شانۆی خۆی ( لە کۆلۆمبیا ) بەجێ‌هێشتو لە ساڵی ١٩٢٢ شـــانۆی ( اتیلییە )ی دامەزراند کە تا ئەمڕۆش بە شانۆی دولین بەناوبانگە ٠ ئەم شانۆیەش شـــانۆی تاقی‌کردنەوە بـــــوو ، دەهات کاری ( ممثلی ) شی‌دەکردەوەو بەرهەڵستی ئەو شەپۆلە بازرگانی‌یەی دەکرد کـــــــە خەریك‌بوو شانۆو سینەمای دادەگـــرت ٠ هەروەها بەرهەڵستی مەسەلەی بـــــــە مەکینەکردنی شانۆی پاریسی بـــوو ٠ دولین چـــەند کارێکی شانۆیی بەڕادەی یەکەم فەرەنسی پیشاندا تا ســـــاڵی ١٩٤٠یش هەر لەم شانۆیەدا کاری‌دەکرد٠ لە ساڵی ١٩٤٢ دا لە بەشی داگیرنەکراوی فەرەنسادا شـــــــانۆیەکی سارتـەری پێش‌کەش‌کرد بەناوی « مێش » ٠ ئەوەی زانراوە کەوا لەگەڵ هەر دەقە نووسینێکدا جۆرە ئوسلوبێکی لـــــــە تەفســـــیردا بەکاردەهێنا ٠ بەنموونە کاتێ کە دەستی دا دراماکانی ئەلیزابیثی ئوسلوبێـــــکی توندی ( عنیف )وای بەکارهێنا کە پشتی بە بەرزبوونەوەی دەنـــــگ‌و بزووتنەوە دەبەست ٠ دیکۆرەکانیشی لەسەر بناغەی وێنەگری‌ی نوێ ئیعتیمادی دەکرد ٠ لـــە ( تەمسیل )یشدا چاودێری‌ی شـــــێوەی ( ئیما )ی دەکرد کە لە دواییشدا لــــە هونەری شاگردەکانی‌دا وەکو بــــارۆ و مارسۆ خۆی نوواند ٠

دووەم کەسی کارتیلەکە لویـــــــس جۆڤیەیە ( ١٨٨٧ـ١٩٥١ ) کە شـــانۆی شانزیلزێ‌و ســـــــتۆدیۆی سەربەئەوەی بەڕێوە دەبرد ٠ لە ١٩٣٤یشەوە کاری شانۆی ئەثینای دەگێڕا ٠ بەوپێیە کـــە خۆی ( ممثل )بوو داوای شانۆی هونەری تەمســــــــیلی دەکرد ، لەگەڵ‌ئەوەشەوە هەواخوازی شێوەی ئینسیجام بوو لەنێوان کەرەستەکانی پێش‌کەش‌کردنا کـــــەوا بایەخی بە کەرەستەکانی تری وەکــــــو دیکـــــۆرو رووناك‌کردنەوە و ئەوانی‌تر

دەدا ٠

ئەو پەردە شانۆیانە ( عروض )ی کە نەخشـــــە کێشی شانۆیی بەناوبانگ ( کریســـــتیان بیجار ) لەلایـــــەنی تەشکیلی‌یەوە جێ‌بــــەجێ‌ی‌دەکردن زۆر بەناوبانگن ٠ ( جۆڤێیە )ش بەوە ناسراوە کـــــە لایەنگری روونال‌کردنەوەیەکی تەواوبوو لە شانۆدا و ملی‌نەدا بـــەر شێوەی تاریکسانی ( تعتیم ) کە ئەوسا باو بوو ٠ بە شێوەیەکی گشـــــتی ئۆسلۆبەکەی ئوسلوبێکی شـــــاعیرانەو فیکریانەی لەسەر بناغەی کلاســیکیەتی نوێکار دامەزرابوو ٠ وە بەو چـــاوە سەیری جۆڤێیە دەکرێت کە شـانۆگەرێکە رێوشوێنی شانۆی نیشتمانی بـــــە ڕەگـــەکانی لاتینی‌و نـاوەراستی‌یەوە ( مەبەس لـــە دەریـــای ناوەڕاستە ) چۆل‌نەکــرد ٠ جۆڤێیە جگە لە شــانۆییە کلاسیکی‌یە هاوچەرخ کراوەکان ، کاری نووسەرانی هاوچەرخیشی پێشکەش دەکرد لە سەرووی هەموویانەوە جان‌جیرودۆ کـە دۆستی‌و ئارەزووی هاوبەشی هونــەری بەیەکەوەی بەستبوونەوە ٠

جیرودۆ هەموو جار دەیگوت کابرای فەرەنسی کە دێتە شانۆ دەیــــەوێ پێش هەموو شتێك گوێ بگرێت ٠ بۆیە دەبێ بایەخێکی زۆر بە نرخی ووشـــەو دەقی نووسراو و شاعرانەیی‌و گفتوگۆ بدرێت ، واتا لە ئەنجامدا بایەخی سەرەکی بــــە دەنگ‌و بە تەفسیری دەنگی ( ممثــل ) بدرێت ٠

هەرچی دوو کەسەکەی ترن ( باتی‌و بیتوێف ) ئەوا بە پێچەوانەی دولیـــن‌و جۆڤێیە بـــــوون لەبابەت ئارەزووی کلاسیکی‌یانەوە ، کـــــەوا رێبـــازی ( تەعبیریەت )یان گرت ٠

گاستون باتی (١٨٨٥ـ١٩٥٢) لــە سالی ١٩٣٠دا کە شانۆی ( مونبرناس )ی دامەزراند بــــە ئاواتی نوێکردنەوەو ژیاندنەوەی سروشـــتە سەرەتاییەکانی شانۆ بوو چ ئیفریقی چ ناوەڕاسـتی‌و چ ئەلیزابێتی ٠ لە کاتێك‌دا کە شــــانۆی جۆڤێیە هـــەولی « روونی‌ی فیکری » و ژیری‌کردووی ( المعقلن ) دەدا باتی بــە شوێن هەنـــدێ زەمینەی ئینفیمالی وا دەگەڕا تاکو هێزەکانی دەروونی‌و ناژیری لای تەماشاکەر بەئاگا بهێنێ ، شانۆکەی مەیلی شێوەی غەیبی دەکرد و هەر بۆیەش

بێ لای وابوو کە شـــــانۆی ئەدەبی شانۆیی دەستکردە ، بـە ئامانجی ئەوەش بـــــوو پێکهاتنێکی هونــــەرانەی وا دروستبکات کە وەکو یەك‌و یەکســـــان ئەدەب‌و مۆسیقاو ســـــەماو هێماکردن‌و تەنانەت بێدەنگی‌و ماتییش دەور بنوێنن ، لە پاشانیشدا هەوڵی بەشانۆکردنی شانۆی دەدا لە رێگای بەلاوەنـانی سروشتەکانی واقیعیەت بەڵام لەمەدا سەرنەکەوت ٠

هەندێ رەخنەگر لەو باوەڕەدان کـە هەر ئەو ژێرکەوتنەبوو پاڵی‌پێوەنا کـــە بایەخ بە شانۆی ( بووکە لەیستۆك ) بدات کە بەهۆیەوە هەلی چەنگ کەوت کە بـە تەواوی دەسەڵاتی بەســــەر مــــاددەی ( تەمسیل )دا بشکێت‌و بـــە تەئسیری ( کریج ) قینی خۆی بەرامبەر بە ( مەثلی زیندوو ) دەربڕێت ٠

( پەردەتەماشا )کانیشی هەندێ کاری مولییریان تێدا بوو بەڵام زوربەیان هی نوسەرانی نا فەرەنسی بوون وەکـــو بیرانـــــدللو ، بریخت ، دوستویفسکی‌و هی‌تر ٠ بەنموونە ساڵی ١٩٣٤ لە ٢٠ تەختەنیگاری شێوە سینەمایی ( تـاوان‌و پاداشت )ی پێشکەش‌کرد ، هەنــــــدێ سیناریۆشی بۆ شانۆی بووکە لەیســــتۆك نووسی ٠

بەڵام جــــورج بیتوییێف ( ١٨٨٤ ـ ١٩٣٩ ) ( ممثل )ێکی رووسی بنەچــــە ئەرمەنی‌بوو لە سەرەتای شەڕی یەکەمــی جیهانی‌دا بـــۆ ( سویسرا ) کۆچی‌کردو کاری خۆی بۆ ئوسلوبی ( ممثل ) یـــان ئەوەی پێی دەڵێن شانۆی ممثـــــــلان تەرخانکرد ٠ لای وایــــــە ( ممثل ) تێوانیکە لە بەینی شــــــانۆو ئاگایی ( لاوعی )ی تەماشاکەر ، کەوابێ کاری ( ممثل ) روو لە ناوچەیەك دەکات کـە کەوتوەتە دەرەوەی ســــنووری ئاگایی ( الوعی )و هیچ عەلاقەی بە بنەتــــای تەئسیری فیکری‌یەوە نی‌یە بەڵکو بـــــــە فراوانکردنی‌یەوە هەیە بۆئەوەی هەموو ئەو ناوچە نەفسی‌یە بگرێتەوە کە ماددەی ئائاگایی‌ی زۆرتر تینووی تیــــادەبێ ، بەتایبەتی لە شانۆدا ٠ جا ئەمە بیتوییێف بە تەواوی لە رێبازی کلاسیکیەتی نوێی خاوەن سروشتێکی فیـــکری جوفیێـــەو قوتابخانەکەی جۆفێیێـــــە جیادەکاتەوە ٠ لای‌وابووکە ( مخرج ) یەکـــە نوێنـــەری تیپەکەیەو بەرپرســیاری تەفسیرکردنی

دەقە ـ پەردە تەماشاکەیە • کاری هەرە گرنگی مخرج ئەوەیە ئـــــەو ناوەرۆکە بدۆزێتەوەو بەهۆی شانۆوە جەستەداری بکات کەوەتانێ لـــە توێی شاعیرییەتی درامادایە ، ئەم کردارە ئاڵۆزەش هەندێ وایتێدەگەن کە دووپاتکردنـــەوەی بیروڕای کریجە دەربارەی سەربەخۆیەتی کاری ( مخرج ) ، هەروەها ســـنوور بۆدانانێکیش کە گەیشتن بە تەماشاکەران دەیخوازێت • بیتوییێف ناحەزی بیروڕاو کۆششەکانی ستانسلافسکی بـوو کە لای وابوو رەنجبەباچوونە کاتێ کە ( واقیع ) بـــە شـــــێوەیەکی فۆتۆغرافی پێشکەشبکەن •

لە تەمسیلیشدا دەوری خەڵکی بزرو گلۆربووەی پەراوێزی ژیانی کۆمەڵایەتی تەمسیلدەکرد ، خۆ ئەو دەورانەی لـــە لە شانۆییەکانی ئیبسن دا دەینواندن ( کە زیاتر پەسندیدەکردن ) زۆر بەناوبانگن• بیتوییێف زور بایەخی بە ماددەی تەشکیلی نەدەدا بەڵکو حەزی بە نەخشەی سادە یان سروشتی دەکردو دەیکردن بە چاکتریـــن باکڕاوندی دەوری مسٹلەکان •

**جان فیلار ( ١٩١٣ ـ ١٩٧١ )**

فیلار نوێنەری نەوەو پشـتی دوای شەڕی گەورەیەو رێوشوێنی شـــانۆی سیاسی چۆڵنەکرد ، سەردەمێك شاگردی دولین بوو • لە ساڵی ١٩٤٧دا مهرەجانی « آفنیون »ی رێکخست کە لە جیهانـدا دەنگیدایەوە ، ساڵی ١٩٥١یش بوو بـــە مدیری « شانۆی گشـــتی نیشتمانی »ی پاریس لەدواییدا شانۆکە مـــۆرکیکی سیاسیانەی وەرگرت‌و لە سـاڵی ١٩٦٣دا بوو بە مایەی لێخستنی •

فیلار بە ( ممثل )و ( مخرج )ێکی لێهاتوو دادەنرێت • داوای کرد کــــە نابێ واز لە دامو دەستوورەکانی کلاسیکی بهێنرێت کە لای وایە ئەمانە کۆڵـــەکەی شانۆی فەرەنسەیین • فیلار شـــانۆیی نووسراوی لە شانۆیی تری تەمسیلکراو جیا دەکردەوە ، لـــە پیشکەشکردنیشدا تێبینی ئەوەی کرد کە دوو لێکدانەوەی جیاواز پێکدەگەن یان لەیەکدەدەن‌و دوو زەمینەی دوو خواست پێویستە بەیەکەوە بژین • لای ئەو تەختەی شانۆ واقیعێکـــە چەند زەمینەیەکی تەعبیری تایبـــەتی بەخۆی هەیە ، ئەمە وادەکات لە ئەنجامدا بەو چاوە سەیری دەوری مخرج بکرێت

کە نووسەری یەکەمی تـــــــــەواوی پیشاندانەکانە • جارێکیان گوتی :

( نووســـــەر شانۆییەکی نووسی ، ( ممثل )یش وەکو شانۆییەکی تـــــر دەینوێنێتو تەماشاکەران وەکــــــو شانۆییەکی تری سێیەم تێ‌ی‌دەگەن ) • جا بەیەکگەیشتنی سێ لێکدانەوەی جیاواز لە پیشانندانا شتێکە بە تەواوی لەگــەڵ بنکەی سەربەخۆیەتی‌ی کریج جووتە •

تارادەیەك فیلار لەگەڵ ئەرتو لەوەدا دەگونجێ کە لای وایە شانۆ خۆپێشاندانی ( هوس )ی ئەفسانەیی‌یە و ڕوواڵەتێکی ناڕاستەقینەی وایە کە دەگاتە ســنووری خەونو جادوو کاتێـــك کە تەماشاکەران تێ‌ی‌دەگەن •

• شانۆی گشتی نیشتمانی • لـــــە سەردەمی فیلاردا بوو بە شــــــانۆیەکی پێشکەوتنخوازی دیمــــــوقراتی رادەی هونەری بەرز ، چەنـــــد ( ممثل )یکی گەورەی تێدا بوو لەوانە جیرار فیلیپ ، ماری سیزار ، جورج ولسون •

ناودارێکی تری شانۆی نوێ جــــان نویس بارۆیە ١٩١٠ کە نوێنەری رێبازی دژ بە کلاسیکیەو بە میراتگری نوسـلوبی بیوتییف دەژمێردرێت • ئەمەش بەتایبەتی لە پێشاندانە بەناوبانگەکەی شــــانۆیی هاملتدا (١٩٤٧) دەردەکەوێت کاتێ کە وەکو پیاوێکی بێ کارەی بەزیو لـــــە بــــــەردەم جیهـــــانیکی دوژمنانەو لـــە تێ‌نەگەیشتن‌نەهاتوودا • هەروەکو پالەوانانی وێژەی وجودی پێش‌کەشی‌کرد• ساڵی ١٩٤٦یش لەگەڵ مادلین رینۆ ( کچە مومەسیلی کومیدی فرانسیز ) بـــە دوو قۆلی کاریان دەکردو بەتایبـــەتی تەرزە شانۆیی وجودیانــەیان پێش‌کەش‌دەکرد ، هەروەکو ( بـــــــاری گەمارۆدان )ی ئەلبێر کامی . ( شەیتانو خواوەنـــــدی چاك )ی سارترو ( محاکەمە )ی کافکا • بارۆ زیاد لەمە هونەری ( بانتومیم )یشی بــــــۆ پەردەپیشاندانەکانی زیادکرد • دەیویست ( ممثل ) حاڵەتی وورووژانێکی بەکۆمەڵو هێرشێکی سەرومڕ بۆ ســـەر خەیاڵی تەماشاکەر سازبدات . لـە ڕێگەی چەند کەرەستەیەکی پیشانندانی توندو بە تەوژمەوە . لێرەشدا پەنای بــــــۆ هەندێ کارو کردەوەی جادووی کــۆن‌و چارەسازی‌یەکەی برد •

دووایی‌ترین نەوەو پشت لـــــــە

« مخرج »ە فەرەنسی‌یەکان ئەوانەبوون کە دراماتوجیای هیچوپووچ . « العبث»ی یونسکۆو بیکیت یان تەرزی گاڵتەجاڕی‌ی پنترو البی ئوسلوبەکانی‌مشتومالکردن هەروەها تەئسیری بریختو مایاکۆڤسکی و دوستویڤسکیش هەر ماوەو نەڕەویتەوە . لە راستیشدا پاریسی شانۆ بەتەواوی فەرەنسایی نی‌یە ، بەڵکو لە دروشمدا جیهانی‌یە چونکە هونەرمەندیکی زۆر لەدەرەوە هاتوونو لێی‌دانیشتوون سەرباری دامەزرانی چەند دەزگاو چالاکی‌یەکی جیهانگیرانەی وەکو میهرەجانەکانی شانۆی نەتەوەکان یان معهدی شانۆیی جیهانی شەپۆلی نوێی شانۆ کە یاخی‌بوونەکەی قوتابییانی ساڵی ١٩٦٨ دەستپێشکەری سەرهەڵدانی بوو لە میهرەجانەکانی جیهانی‌دا خۆی دەردەخاتو دەیکا بە مەیدانی جلیت‌بازی کردن بە داڕشتە توندەکانی بیروڕاکانی کریج دەربارەی سەربەخۆیەتی‌ی شانۆ . ئەم شەپۆلەش بە تەواوی لە شانۆی کۆنو پێش هەموو شتێکیش لە شانۆی ئەدەبی‌و شانۆی ووشە دابڕاوە . جا یاری‌و دەستکاری کردن بە دەقەکان راستوچەپ ، بەیەکەوەگرێدانی چەند دەقێك با هی یەك نووسەریش نەبن ، هەروەها رامکردنی هەڵبەستو پەخشانی نا ـ درامایی ، لە دواییشدا سیناریۆ دانان لەلایەن ( مخرج )ەوە ئەویش بە کەیفی خۆی‌و بێ‌ئەوەی پاڵ بە دانراوێکی ئەدەبی بدا ، ئەمانە گشتی قەدەغە نی‌یە . لە پیشانگای شانۆی « پێشرەوی »دا پایەی یەکەم دەدرێ بە هیماو چۆنیەتی هەڵس‌وکەوتو جووڵانەوە بەوپێ‌یە کە هۆیە هەرە لەپێشەکانی تەعبیرکردنن . رەنگبێ راستگۆترین نموونە بۆ یاخی‌بوون لە شانۆی کۆن کە ناوی ( دژی شانۆ ) یان ( نا ـ شانۆ )ی وەرگرتووە ( هیپننگ ) بێت کە لە پەنجاکان لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا سەری‌هەڵدا بە تایبەتی لە نێوان تەشکیلی‌یەکاندا . ئەم (هیپننگ)ەش وەنەبێ ئارەزوومەندی‌یەکی رووتی شانۆ بێت ، نا ، چونکە سەیر دەکەیت کە بنەڕەتەکەی بەلاوەنانو ڕووخانو بێزوبۆ کردنە لە هەموو جۆرو شێوەکانی رێکوپێکی شانۆیی . ئەم جووڵانەوەیەش وەکو هونەرێکی ئاڵۆزی دروشم

تەومژاوی چەلومل لـــە پەراویزی شانۆدا پەیدا بوو ٠ زۆر زەحمەتە پیـاو بزانێ ئـەم جوولانەوەیە چیـیـەو چی نییە ، چونـکە پێش هـەموو شتێك ( جێگا )یەکی شانۆیی هەمیشە نییەو بۆی هـەیە لە هـەر شوێنێك‌دا راست‌بێتەوە لە هۆلیش‌دا تەختـەی شانۆ جیاواز نییەو « سینۆگرافیا »یەکی تێدانییە بەلـکو « اکسسوار »ێکی رووت کـە سوریالیانە یان بە رێکەوت بۆ رووداوەکـە دەست دەدا ٠ (ممثل) بوونیان نییە ، بەلـکو ئەوەی هەیە ، هەموو ئەوانەن کـە لـە ( رووداوەکە )دا بەشدارن، دەکـەن کـە تەماشاکەرانیش دەگرێتەوە ، کارو دەقی ئەدەبییش هەردووکیان نەبوونن ، ئەوەی دیاریشە بریتییە لـــەو کـارو شتە ناکاوانەی کـە دەیانەوێ حـــالی سەرەگێژەو مێشك شلەقانی تەماشاکـەر بسازێنن ، گرێی وتووێژی تێدانییە ، بەلـکو ئاخاوتنێکی دادڕ دادڕی وا کـــە مەنتیق دارێکی کۆکردنەوەیان بە نێواندا ناهێنێتەو شێتانە پەیتـا پەیتـا دووبارە دەبنەوە ٠ هەروەهـــا دینامیکیەتیش لـــە کایەدا نییە ، لە باتی ئەوە هەندێ کردەوەی وروژێنـــەری بێ هـــەموو چوارچێوەیەکی جوانی قووتدەبنەوە کە تاکە مەبەس دەس‌بردنە بۆ شتی سـەیری زبری بێ‌تام (هیپننگ) گوێیان نـەداوە بەوە ئایا کـــەس سەیریاندەکات یان ناکات ٠ ئیتر بە شێوەیەکی گشتی ئـــەم جوولانەوەیە واپێ‌دەچێت کە هەوڵدانێك بێت بۆ پیشاندانی بێ‌مانایی ژیان بـــە شێوەیەکی (بیانی‌بوونانە)و کەم پەیوەند بە شانۆوە ٠

تجریبیەت یان هەوای تاقی‌کردنەوە لە شانۆدا مـــانای نا ـ کۆمەڵی‌ی شانۆیەو هەرچەند بەنیهادیش دیموکراتی بن دیسان هونەرەکە دەکەن بە پارووەیەك تەنیا بـــە هەڵبژاردەکان قووت بدرێت ! چونـــکە چارنییە دەبێ کۆمـــەڵیکی وا هەڵبژێرن تەماشایان بکات کە بە بیرو بە چەژکـــە هاوشانی ئەم تاقی‌کردنەوانە بن ، کـــە هەر لە تاقی‌کردنەوەکانی زانایان دەکات لە سەردەمی تازە کوورەییاندا ٠ بـەڵێ بێگومان زاناو هونەرمەندی شـــانۆیی هەردووکیـــان لـــە یەك سەرشارەوە بۆی‌دەردەچن ٠ ئەگەر تاقی‌کردنەوەکـــە سـەرکەوت ئـەوا چاکە ، ئەگەرنا دەبێ

شتێکی تر بهێنن ! ئیتر ئەمـــە حـالی زۆر شانۆ بوو لـەو شانۆ تاقیکردنەوانەی بــــە (پێشـــڕەوی) نـــاودەبرێن ، لەپێش‌هەموویان (شانۆ ـ مختبـــەری ) غروتۆفسکی‌ی هۆڵەندی ، کـــە تـــاقی کردنەوەکەی پاش دە ساڵ کـــار ئنجـــا سەرکەوت ، کە جاران مایەی گاڵتــــەو ناوو نەتۆرە بوو ، کەچی ئەمڕۆ بـــــە شۆرشێکی ڕاستی شانۆو تەعبیرێـــــکی راستگۆیانە لە سەردەمەکەمانو شتی‌تر دادەندرێت ، بەڵکو زۆر کەسی وا هــەن کە لایانوایە کۆششەکـانی غروتوفسکی دووا هەلی رزگارکردنی شانۆیە لـــــە کۆستکەوتنی ، کەچی خەڵـکی تری وا هەن وا دەزانن ئەم کابرا هۆڵەندی‌یە دوا خەنجەری خۆی لە لەشی زامداری شـانۆ دەژەنێ ٠

جا دوور لە پیاهەڵدان و تووڕهەڵدان ، کارو کۆششی غروتوفسکی ، تەنیـا شێوە پێشنیارێکە هێشتا لە قاڵبی تەواوی خۆیدا دەقی‌نەگرتووە ٠٠ هەر ئەو بوو کە لـــە پاش زنجیـــــرە تاقی‌کردنەوەیەك بــــە ئامـــــانجی قووڵکـــردنی زانینـــی کاری (ممثل)و گەوهەری شـــــانۆ بــــە قۆناغیکی (تطور)دا تێپەڕبوو ٠٠ جـــــا هـــات لـــە دامودەستووری دێرینەکانی رۆژهـــەڵاتی کۆڵییەوە لەوانەش ڕاوو رەسمی جـــادووبازیو ئایینەکـــانو بەزمەکانی فەلسەفی ) ، بەو بڕوایە کـە هەولێك‌بدا شـــــانۆ پایەی جـــادوویی ـبەزم‌بابەتی دێرینەیی خۆی وەربگرێتەوە کـــە بە هۆی ژیبیرمەندیی لەڕادەبەدەر لەدەستی چووە ، هەروەها شانۆ کـــاری « تطهیری ـ پاکژکەرەوەیی » خـــۆی نوێ‌کاتەوەو گرێ‌کـــانی « ئاناگایی ـ لاوعی » بەگوێرەی زاراوەکـانی نوێی زمـــــان شی‌بکاتەوە ٠ دەتوانین مەیلی « دینامییەتی دەروونی » لـــە شـــانۆی غروتوفسکی‌دا ـ بە هەوڵدانێك ناوببەین بۆ ئەوەی پەلی تەماشاکەر بگرێت بـــۆ باری ئیعتیرافو رەخنە لەخۆ گرتنێـــکی بێ‌دەنگ ٠ ئەو تەکنیـکە تازەبابەتەیش کە بەکاردەهێنرێت هەموو دابڕێـــــکی مادیو نەفسی لەنێوان ممثلو تەماشاکەر هەڵدەگرێتو هەردووکیـــــان لەیەك کردەوەدا تێکەڵدەکات ٠

رێبازی دووەمی غروتوفسکی رێبازی لێکدانەوەی دەقی دراماکەیە لەســـــەر بناغەی دەرخستنی مایەی دژیو ناکۆکی

له هه‌لویستەکاندا ( مەرگەساتو گاڵتە ، وورووژاندنو دڵنیایی ، ریسواکردنو پەرستن ) ئەمانەش کە لەیەك جەستەدا جۆشیان پێدراوە · سیناریۆکانی غروتوفسکی بەتایبەتی ئەوانەی لەسەر بنچینەی درامای رۆمانسی پۆڵەندی هەڵچیزاون هەوڵدەدەن کاردانەوەی (رەدفعل)ی وەها لای تەماشاکەران پەیدابکەن کە بەتەواوی لە کاری شانۆی کۆن جیاواز بێت ، جا غروتوفسکی ( بەگوێرەی تیۆرییەکانی کارل‌یونگ ) هێرش‌دەباتە سەر نائاگایی بەکۆمەڵو نموونە سەرەتاییەکانی لەرێکەی زەبری خورپە «صدمە»یکەوە کە لێك‌هەڵبوونەوەی ماناکان پەیدادەکات · هەروەها سینوغرافیایەك بەکاردەهێنێ کە لەسەر بناغەی دژایەتی رەنگو شێوەکان هەڵدەستێ · ( مەشەل )ەکانیش هەستوسۆزی خۆیان بەرکو ئەوپەری هەڵچوون جلەوکێش دەکەن · لێرەدا غروتوفسکی میکافیللی‌یەکی راستەقینەیە· چونکە دێ مەرجەکانی دەرەوەی درامای رومانسیی وەکو کاتو جێگا ( کە لە وولاتەکەی خۆیدا شتێکی پیرۆزن ) دەگۆڕێت ، بەو ئامانجە کە هەڵتەکانێك پەیدابکات کە لای پێشرەوی‌یەکان بووبووە گەورەترین ماخولیا ، لە راستیشدا گەورەترین دەسکەوتی ئەم شانۆگەرە پۆڵەندی‌یە دۆزینەوەی ( تەمسیلی لاوەممی )یە واتا ئەوەی گەرەکیەتی واقیعێکی تازە خلق بکاتو پاشان لە کارگەیەکی خۆکرددا کە لەسەر کۆلەکەکانی کەلەپووری هونەری‌و شارستانی‌و فەلسەفی هەموویان دامەزرابێت مشتومالی بکات ·

کەوابێت لێرەدا ممثل بۆی نی‌یە لاسایی هەڵویستەکانی ژیان بکاتەوە یان ئەوەی خەیاڵی پێی‌دەڵێ پێشانی‌بدات ، بەڵکو دەبێ تەعبیر لەو ( رەدفیعلە ) ئەندامی‌و کردەوەییانە بداتەوە کە بە تەئسیری دەقە دراماییەکە پەیدابوون · جا بێ‌گومان دەتوانین بەچاوێك سەودا لەگەڵ رێگەی (ممثل)ی غروتوفسکی بکەین کە بەرگێکی نوێ‌کاری مەبەستەکانی ستانسلاڤسکی‌یە ·

بەڵام شانۆی ( کریکو ــ آئنین )ی پۆڵەندی کە تادیوش کانتور بەرێوەی دەبات ئەویش خۆپێشان‌داتێکی تری مەیل‌خوازی (نزعە)پێشرەوایەتی یە کە

دەیەوێ شانۆیەکی سەربەخۆ دابمەزرێنێ نە ئەدەبیو نە سروشتی پاڵنەداو بەسەر ماددەی (وەهم)دا • پێشکەشکردن لای کـــانتور بریتییە لـە خۆپێشاندانێکی خولقاندن کـــە هیـــچ شتێ بەربەستی لێنەکات بەڵکو ئێوەدانەوەی ئەو شـــتە بێت کە ناوی بە «مەیلخوازیی شانۆیی» دەبات • کەوابێ شانۆ لێرەدا مغامرەیەکی گەورەیەو بەندوبەست شکاندنەو خۆشیی سەرچـــەڵیو چەشتنی ناڕاستەقینەییە • کانتوریش غروتوفسکیی هاونیشتمانی خۆی ناســـا ، دەیەوێ توندوتیژترین ڕەدفیعل لای تەماشاکەر بووروژێنێ ، کانتور ماوە بە تەماشاکەرانیش دەدات کە لە ڕووداوی شانۆییەکـەدا بەشـــداری بـکەن • باوەڕی وایـــە کـــە دەبێ کەرەستەکانی تەعبیر بەهێزو دلڕفێنو وەروژێنەر بن ، ئەمانەش بەکـــاری ناڕاستەقینەیی هەلوێستو ناکـــاوییو ڕاچڵەکین پێـکنایەن • لای ئـــەو شێوەکانی تەمسیلکردن ئێجگار جیاوازە ، ماکیاجی مەثل زۆر لە پێویستبەدەرە ، جلوبەرگی سەیرو سەمەرە •• هەموویشی بە ئامانجی ڕووخـــاندنی واقیـــعو جێگرتنەوەی بە واقیعیـــکی نوێتر • ئەدەبیش لـــەم جـــۆرە شانۆیانەدا مڵکـــەچی چـرو خەستکردنەوەیەکی ئێجـــگار گـــەورەیە • کـــەرەستە پێشچـاوەکانیش ( وەکـــو دیـــکۆر ، جلوبەرگ ، ڕووناککردنەوەو •• تاد ) دەیویست بیانکا بە گەوهەری ڕاستەقینەی ئەو ( واقیعەنوێیە ) ئەو شەپۆلە نوێیەی شانۆ کە زۆر کەس بە دوائەنجـــامی جووڵانەوەی پێشکەوتنە گەورەکـــەی دەزانن ، ماکی تەنگوچەڵەمەی لەخـۆیدا هەڵگرتووە ، ئەو شڵەژانو ئاژاوەیەش کە باڵی بەســـەر ژیانی شانۆیی ئەورووپاو ئەمەریکادا کێشاوە هـــەندێك بە قوڵلەی بایلی دەچوێنن کە زمانانی زۆری تێـــدا تێکەڵبوو •• لە ڕاستیشدا شانۆی کۆن لەگەڵ ئەو هەموو هەژانە شۆرشگێڕانەی ژێر زەوییو ژوور زەوییـــانەشدا ، تەنیا بە ڕووالەت ئیشدەکـــا ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە شانۆ کـــەوتە پشتی شەپۆلە نوێیەکانو زوری لێبردن • لەوانەشە ئەم شتە ڕاستەقینە دیالکتیکیە هەمیشەییەکە دووپاتبکاتەوە دەربارەی ئەوە کـــە پێکهاتنەکە ئەنجامی ململانێی

کۆنە لەگەڵ نوێ ، ئەگەرچی ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران لایانوایە وەرگرتنی نوێیەکانی هونەر دەبێ لەسەر حیسابی بەدەرەوەنانێکی تەواوی کۆنو کۆنینـــە بێت ، چونکە پێوانە نوێیەکانی ستاتیك لەخۆیەوەو بێ‌گرێ شوێنی کۆنەکـــان پڕناکەنەوە ، بەو بڕوایە کـە کۆنەکان دەتوانن تا ماوەیەکی ئێجـــگار دوورو درێژ بمێننەوە ، لیکۆلەرەوەی نـــاودار «موکاروفسکی» لای وایە کـــــە نوێ هەڵدەکشێت‌و یاساکانی خـــۆی لـــــە مەلبەندێکدا دادەڕێژێت کە ئەویش یاسای کۆنی خۆی هەیە · بەنموونە دەڵێین لـــە سەدەی پانزدەهەمدا لە ئەوروپادا هونەری چەرخی ناوەڕاست کۆتایی هـــــاتو هونەری سەردەمی ڕاپەڕین دەستی‌پێ‌کرد ، بەڵام ئـەم قسەیە تەنیـــا ئیشارەتێکی گشتی‌یەو سنووربڕینێکی کردەوەیی نی‌یە چونکە ئاسارەکانی چـــەرخی ناوەڕاست سەرومڕ درێژەدەکێشێت‌و تەنانەت لـــە تواناشی دایە ببووژێتەوە یا لە بەرگێو شێوەیەکی تریشدا بێت · موکاروفسـکی ئەم حاڵە لەگـــەڵ هەرەمێکی چین چین‌دا بەراوورد دەکات ، کـــەوا چینی بچووکی سەرەوە ( کـــە پێشرەوە )نوێ‌ترینیانەو چینەکانی خوارەوەش کۆنترو پتەوترن · ئەم پەیکەرە هەرەم‌شێوەیەش لەگـــــەڵ توانای تەماشاکەراندا بـــۆ شتەوەرگرتن دەگونجێت تواناکـــەش پاڵی داوە بـــە سستەمی پلەپلەیی‌و ئاستی ڕۆشنبیری‌ی پایە کۆمەڵایەتی‌یەکان · بەڵێ ، بێ‌گومان ئەوەی ئەم کردارە ، ئاڵۆزدەکات بریتی‌یە لە فەرقو جودایی نێوان پشتو نەوەکان، نێرومێ ، پیشەو فێربوونو خوێندەواری‌و هی‌تر ·· ئیتر باسی هاوچەشنی لێرەدا جێی‌نابێتەوە · لـە ڕاستیشدا هەرچەندە یاســـای جـــوانی کۆن‌تر بێت ئەوەندە لێ‌تێگەیشتن‌و قەبوول کـــــردنی زیاتر دەبێت ، ئەم بنیات‌پەروەری (البنائیە)ی یـــەی مۆکاروفســـکی‌یە بـــەرەغمی لق‌وپۆپەکـــانی لـــەیەك قســـــەدا کۆدەبێتەوە : نە دەستوورو نە نرخەکـان هیچیان شتێکی چەسپاو نین ، بەڵـــکو بەوێنەی کردەوەی دینامیکی بەپێی یاسای دیالکتیك دێنودەچن ، لێرەشدا گەوهـــەرە سەرەکییەکانی یاساکە بریتی‌یە لە ڕێبازە نوێیەکان‌و ریبازە کۆنەکانی شانۆ ·

**لە گۆڤاری ( آفاق عربیە )وە ژمارە ١٠ـ٩٧٩ وەرگیراوە ع ·· بیمار**

# ئەو پیاوەی
# ٧٤ هەزار ووشە دەزانێ

## باسێك دەربارەی زمانو فەرهەنگی زمانی فەرەنسی

ئەمـــە دیدەنی‌یەکی پروفیسور ئالان لورونە Alain Lerond کـــــە بەناوبانگترین فەرهەنگدانەری نوێی زمانی فەرەنسی‌یە . لەم چاوپێکەوتنەدا پێمـــــاندەڵێ چـــۆن فەرهـــەنگێك دروستدەکرێتو چۆن دیواری تـــەلاری زمانێك هەڵدەچنرێت :

**پرسیار : لەم فەرهەنگەدا چـــەند ووشەتان کۆکردۆتەوە ؟**

وەڵام : کەمێك لە ٧٤ هەزار ووشـە زیاتر .

**پرسیار : لەچاو هەموو تاکـەی زمـــانی فەرەنسی‌دا زەحمـــەتە ئەوە تێبگەین کە ئەو ٧٤ هەزار ووشـــەیە چ دەنوێنێت ؟**

وـئەمە لەبەرەوەو بەرێکی باسدەکەم . وابزانم پیاو بۆ راپەڕاندنی کاری خۆی بـــە شێوەیەکی بـــاش پێویستی بـــە بەکارهێنانی هەزارو پێنجسەد ووشـــە دەبێ . ساڵی ١٩٥١ سوڤاجو و کوکنهایم لە کتێبەکەیاندا « فەرەنساوی بنچینـــە » لێکۆڵینەوەیەکی باشیانکرد ، کـــە ئەم لێکۆڵینەوەیە گەلێ پرسیاری گرنـــگی خستنە بەردەم ، چونـــکە لـــە سەرەتاوە دەستیانکرد بە پشکنینەوەی بەرهـــــەمە ئەدەبییەکان پاشـــان لە رۆژنامەکان ، پاشان لێکۆڵینەوەی مەیدانی بەهـــــۆی ئامێـــری تۆمـــارکردنەوە ، بـــەڵام ریکۆردەرەکەیان لە کوێ دانابێ باشـــە ؟ لە سەرتاشخانەیەکدا ، پاش مـــاوەیەك لەســـەر رستەی تۆمارکەرەکە ووشـــەی (بیرمانەنت)یان bermanente [1] بەمانا

(١) لەم باسەدا بۆ مانای ووشەکـان ، مـــانایەکی بنـــەڕەتی‌و باو هەڵدەبژێرین .

(هەمیشەیی) بەرگوێ کەوت پاشان چوونە چاپخانەکان بۆ تۆمارکردنی هەندێ ووشەی زۆر گشتی • بەڵێ زۆرتر گوێمان لە ووشەی دمی Demi بەمانا پەرداخەبیرە[٢] دەبێت ، بەڵام خەڵکەکە لێرانە باسی رێسزو سیاسەتکارانو کاروباری ژیانیش دەکەن • ئیتر بەم رێگەیە ئەم دوو لێکۆڵەرەوەیە لیستەیەکی ١٥٠٠ ووشەی بنچینەییان جێگیرکرد ، ئەمەش هەروەکو دەبینین کەمە •

**پرسیار :**

**دەڵێن گوایا راسین لە هەموو زماندا تەنها هەشتسەد ووشەی بەکاردەهێنا ؟**

**وەڵام :**

راستە ، بەڵام لە راستیدا دەبوو دوو ئەوەندەش بەکاربهێنێ • شارلمیلەر لێکۆڵینەوەیەکی نوێی هەیە لەسەر راسین نا ، بەڵکو (کورنی) کە دەری خستووە هەزارو پێنجسەد ووشەی بەکارهێناوە •

**پرسیار : کەوابێ هەر ئەوەندەی کە دانیشتووانی چاپخانەکان بەکاری دەهێنن ؟**

وەڵام : بەڵێ • بەڵام رەنگە هەمان چەشنە ووشە نەبن • سەبارەت بەوە کە چاپخانەنشینەکان لەو رۆژگارو هەلومەرجەدا نین کە (کورنی)ی تێدا دەژیا • ئەوەی راستی بێ ، دەبێ نەك هەر ووشەکان بە لیستە بیگیرێن بەڵکو دەبێ مانا جیاوازەکانیشیان بەسەربکرێنەوە • بەم گوێرەیەی کە لە تێکڕای ناوەندیدا هەر ووشەیەك لە زمانی فەرەنسی چوارمانای جیاوازی هەیەو هەندێ جاریش ووشەی وا هەیە ٤٠ هەتا ٥٠ مانای هەیە ، سەراپا ئەگەر بمانەوێ ژمارە ووشەیەکی بپشکنین کە لە ووشەکانی کۆرنییان چاپخانە بەرگوشادتر بن ، ئەوسا دەبێ نزیکەی پێنجهەزار ووشە هەڵبژێرین کە لە رێگەی پەلهاویشتنیانەوە بۆ مانای جیاواز دەگرنە نزیکەی بیست هەزار بەکارهێنان ، ئەمەش لە راستیدا ناوکێکی گەورە بۆ مرۆڤێك پەیدادەکات کە بڵێن رۆشنبیرییەکی باشی هەیە، دوایی لەدەوری ئەم ناوکەدا هەموو فراوانکردنێکی شیاوو بۆ هەموو بووارێك لە توانایدا دەبێت • ئنجا بەم جۆرە دەگەینە ٧٤ هەزار ووشە ، لەکاتێکدا کە هەندێ

---

(٢) مانای پیت بە پیتی ئەم ووشەیە (نیوە) بەڵام فەرەنسییەکان بەمانا پەرداخی بیرەی چارەگە لیتری بەکاردەهێنن •

بوواری شـــارەزاییش وازلێدەهێنین ، وەکو زانستییە سروشتییەکان کە ئێمە لە فەرهەنگەکەی خۆماندا لاماندا‌ون ، لە بوواری (رووەکزانی)شدا تەنیـــا باسی رووەکەکەو ناوی خێزانەکەیمان کردووەو بەس ، بەنموونە ووشەی (باینجان)مـــان هێشتووەتەوە ، بەلام چەند جۆرێك باینجان هەیە پێیاندەلێن میلوجین Melogene ئێمە نەماننووسیون چونـــکە لەگـــەڵ بۆچوونی بنەڕەتی فەرهەنگەکەی ئێمەدا ناگونجێت ٠

**پرسیار :**

**باشە چۆن زانیتان ئەم چەشنە باینجانە هـــەیە ؟**

**وەلام :**

ئەمە لە فەرهەنـگی لوپیتی لاروسدا هـــەیە Lepetit Laronsse

**پرسیار : گالتەیە ؟**

وەلام :

نەء ، بەلام فەرهەنگەکەی لاروس ئەو ئاسـۆیەی فەرهەنگی ئێمەی نیـــیە ٠ ئەو تەنیا ٤٥ هەزار ووشەی تێدایـــە ، هەندێکیمان نەخستە نـــاو فەرهەنگەکەی خۆمـــانەوە ، ئەویش گـــەلێ ووشـــەی فرێدراوە بەنمـــوونە گەلێ ووشەی ئەدەبیی کلاسیکی . ئێمـــە وەرمانگرتوون ، هەروەها ووشـــەی پزیشکیو زمانزانی کە دانـــەرانی فەرهەنگەکەی تر زۆر بە ( تایبەتی )یان لە قەلەمداوە ٠ هەر فەرهەنگەی رێگـــەو کەسێتی خۆی هەیە ٠

**پرسیار :**

**بەشێوەیەکی گشتی فەرهەنگدانەران فەرهەنگی یەکتر دەخوێننەوە ؟**

وەلام : بـــەلێ ، خۆشبەختانە ، هەرواش‌بووە لەوســاوە کە فەرهەنگەکان یەککران ، بەم شـــێوەیە چاوێرییان زیاتردەبێتو بۆ یەکتر راستدەکەنەوە ٠ بۆیە یەکەمین فەرهەنگێك کە شایانە وەکو گەنجینەیەکی زمـــــانی فەرەنساوی ( ئەگەرچی فەرهەنگێکی فەرەنسـاوی ـ لاتینیشە ) هەڵبگرێت فەرهەنگی قەشـە فیلیپیر مۆنیێ سالی (١٦٣٦)ە کە ئێمـە لە کارەکەی خۆمـــاندا بەکاریدەهێنین : خـــۆمو قوتابییەکانم ووشەی کرداری « برولیێ Brûler » مـــان وەرگرت سەیرمانکرد مۆنیێ سێ مانای داوەتێ ، بەلام لە چاپەکەی دووەمی فەرهـــەنگی ریشلییەی سالی ٧٠٦ ادا دەبینین ئـــەم کردارە ١٠ مانای هەیە ٠ ئەمەش مانای وانییە کە لە ماوەی سێ چارەگە ســـەدە

حەوت مانای نوێی دەستگیربووە . نا ، بەڵکو ئەوەیە کە قەشە مونیێ ئەوسا سێ مانای بەرچاوکەوتووە چونکە چەند فەرهەنگێکی کەم نەبێ لە بەردەستیدا نەبووە بەڵام سالی ١٧٠٦ ریشلییێ زۆرتری لابووە . لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە کارێکی باشە ئەگەر فەرهەنگئدانەران لەیەکتر وەربگرن .

**پرسیار : ئایا لەسەر ووشەی نوێ پێشبرکێیان لەنێواندا دەبێ ؟**

وەڵام : پێشبرکێ ! نەء . وانازانم . بابڵێین بەپێچەوانەوە هەڵەنگوتن روودەدات ، من کە سالی ١٩٧٣ ئەو بەشانەم کردەکە بە دوو پیتی Pb دەستپێدەکەن لە بەرامبەر ووشەی فالوکرات Phallocrete دا دوودڵ بووم . کە لەئارادانەبوو و لە پێرستی ووشە نوێیەکانیشدا نەبوو بۆیە من لە فەرهەنگەکەدا نەمنووسی ، چونکە پێویستە فەرهەنگەکە تەنیا شتە بەنرخەکانی لەناودا تۆماربکرێت .

**پرسیار : جگە لە سەرپەرشتیی ئێوە چ کارێکی ترتان لە کۆمەڵەکەدا کردووە ؟**

وەڵام :

« ئیشتیقاقی »و « مێژوویی » بە من سپێردرابوو ئەمەش مانای وایە دەبێ لە A تا Z فەرهەنگەکە بخوێنمەوە ، واتا هەر ٧٤ هەزار ووشەکە ، بڵێم لە کوێوە هاتووەو یەکەمجار لە چ مێژوویەکدا دیومانەو لە چ دەقە نووسینێکو بە چ نووسێنیکو بە چ مانایەکو ... بەکارهاتووە .

**پرسیار : جا چۆن ئەم هەموو کاروبارانە دەزانرێن ؟**

وەڵام :

پێش هەموو شتێك کتێبێکی بنچینەیی هەیە زمانەوانەکان بە F.E.W ناوی دەبەن کە کورتکراوەی ئەم ناوەیە:

Franzosisches etymologische Worterbach

کە مانای « فەرهەنگی ئیشتیقاقیی زمانی فەرەنساوی »یە والتەر ڤون فارتبورگث داینابوەو ئنجیلی بە فەرەنسی بووە - کانە « نووسەرەکەی سویسەرییەکی ئەلمانییە لە شاری بال ژیاوە و بە تەنیا لە ساڵەکانی بیستدا نەك هەر هەموو فەرهەنگەکانی فەرەنسیو فەرهەنگەکانی لەهجەکانی هەرێمە بەفەرەنسیبووەکانی کۆکردەوە ، بەڵکو هەرچی توانیو هەمە جۆر دەقە ئەدەبییەکانی بەخۆی

دەپشکنی ٠ بەڕاستی ئەم کارەش مێژووی
نارەزوویەکی لەخەڵك بەدەرمو لەو
بڕوایەدام کە ژیانی هەموو خێزانەکەشی
تێكداوە ٠

پاشان کەم کەمە کۆمەڵە
لێکۆڵینەوەیەکی لەدەوردا پەیدابوو هەندێ
جار پەنجا کەس دەبوون کە بنکەی گەورەی
لێکۆڵینەوەکانی جامیعەی ( بال )یان
دەنوواند لە ڕۆژانی ئێستاشدا ئەم تاقمە
دەیانەوێ یەکێ لە ١٤١ بەشەکەی ئەم
کتێبە کە تا ئەمڕۆ پێی‌گەیشتووە
دووبارەی بکەنەوە ٠ بەراستی کارێکی
مەزنە ٠ ئەم فەرهەنگەش نرخی گرانە ،
بیرمە وەختی خۆی کە تازە ژنم هێنابوو
بۆ ئامادەکردنی نامەی دکتوراکەم لەبارەی
زمانی ڤالونی‌یەوەو بۆ خوێندنەکەم
پێویستم بەم فەرهەنگە هەبوو بیکڕم ،
ئەوسا بە ژنەکەم گوت یان ئەو فەرهەنگە
یان ژووری نانخواردن ٠ لە دواییشدا
فەرهەنگەکەم کڕی ٠

**پرسیار : بەلای ئێوەوە سەیرنی‌یە
فەرهەنگێکی سویسەری‌و ئەڵمانی
شەرحەکانی بە زمانی ئەڵمانی نووسرابێتو
ببێتە فەرهەنگی بنچینەیی بۆ خوێندنی
زمانی فەرەنساوی ؟**

وەڵام :

بەڵێ ڕەنگە ئەم شتە سەیر بێت ٠
بەڵام ڤارتبورگ فەرهەنگەکەی خۆی
پێشانی چەند دەزگایەکی بڵاوکردنەوە دا
لە فەرەنسا بۆیان چاپ‌نەکرد ٠ پاشان لە
بەرلین‌و دوایی لە (بال) بڵاوکەرەوەیەکی
دۆزی‌یەوەو کتێبەکەی چاپکرا ٠ بەڵام
لەچاو زانایەکی زمان ئەمە شتێکی
سەرسوڕمێن نی‌یە ٠ دەبێ بزانین کە
زۆربەی ئەو دەقانەی تایبەتن بە مێژووی
زمانی فەرەنساوی ئەڵمانەکان
بڵاویان‌کردوەتەوە ، لە سەدەی
نوزدەهەمەوە هەتا سەرەتای سەدەی
بیستەم زوربەی چاپی دەقە کۆنەکانی
فەرەنساوی لەلایەن جامیعەکانی ئەڵمانیاوە
بڵاودەکرایەوە ٠ با نموونەیەکت بۆبێنم
کە لەخۆم قەوماوە ٠ من گۆرانی‌یە
دلداریەکانی خاوەن کۆشکی ( کوسی ) کە
شاعیرێکی گۆرانی نووسی دوایی‌یەکانی
سەدەی دوانزدەمینەم وەکو نامەی
دکتۆرای دەوڵەتی بڵاوکردەوە ، کە
چاپی پێشووی بۆ سالی ١٨٨٣
دەگەڕایەوەو فریتز فانی ئەڵمان
چاپی‌کردبوو ٠ نابێ فرانزبوپی ئەڵمانیش

لەبیربکەین کە زانستی بەراوردکاری زمانی داهێنا ٠

**پرسیار : خوێندنەوەی فەرهەنگێکی وەکو فەرهەنگەکەی واربتورك سەخت نییە ؟ ئایا من بۆم دەخوێندرێتەوە ؟**

وەڵام : بێگومان ئەگەر ئەڵمانی بزانیت ٠ من چەند ساڵێك ئەم فەرهەنگەم بەکارهێناوە ٠

**پرسیار : کەوابێ من وای بۆ دەچم کە هەموو سەرچاوەکانی پێشوو لەم فەرهەنگەدا دەبینین ٠ بەڵام ئایا یەکەم فەرهەنگی فەرەنساویمان لاماوە ؟**

وەڵام :

بەڵێ ، پیاو لەوە سەریسوڕدەمینێ کە ئەم فەرهەنگەمان درەنگ پێگەیشتووە ، ئەویش فەرهەنگە فەرەنساوی ـ فەرەنساوییەکەی پییر ریشلیێیە کە لە ١٦٣٠ دایناوە ، بەر لەم مێژووە چ فەرهەنگی ترمان نەبووە مەگەر فەرهەنگەکانی فەرەنساوی ـ لاتینی ئەوانیش زۆر کۆنتر نەبوون ٠ چونکە ئەدەبی لاتینی ماوەیەك وون بوو ، تا سەدەی چواردەهەم ئنجا سەری هەڵدایەوە لە پاش تەرجەمەی رەنگینی ( تیت ـ لیف Tite-Live ) لەلایەن پییر بیرسویرەوە ، پاش ئەویش نیکولا دوریم فەیلەسوفەکانی تەرجەمە کرد ، ئنجا سەردەمی راپەرین هات ٠ سەردەمی رونسار ، ویبلی کە هەموو شت تەرجەمەدەکرا ٠ ئەمەش مێژوویەکی گرنگە بۆ هەموو فەرهەنگەوانەکان ، چونکە هەر لەم ماوەیەدا بوو کۆمەڵە ووشەیەکی لاتینیی رووتی بەفەرەنسیکراو کەوتە ناو زمانی فەرەنسییەوە ، واتا بە پێچەوانەی زۆر ووشەی تری لەلاتینییەوە هاتووی وا کە لە وولاتی غولدا قسەیانپێدەکرد زمانەکە بە پەرەسەندنی لەفظیدا تێپەڕ نەبوو ، کە لە زمانی قەیسەرەوە ووشەکانی چەرخاوچەرخ گۆڕانیان بەسەرداهاتووە بە ڕادەیەك کە زمانەکەمان ئەمڕۆ پڕیەتی لە جووت ، واتا ئەو ووشە جمکانەی کەوا هەمان مانا یان مانای زۆر نزیکیان لەگەڵیەکدا هەیە هەردووکیان لە لاتینییەوە هاتوون بەڵام لە عەینی لاتینی نا بەلکو لە هی چەند سەدەیەکی جیاوازەوە ٠

**پرسیار : لەتوانادا هەیە نموونەیەك باسبکرێت ؟**

وەڵام : بەڵێ ٠ ووشەی ( فراجیل Fragile ) بە خەیاڵدا دێت ٠ کە یەکەم جار لە فەرەنسیدا دەرکەوت پاش ئەوەی

یاساکانی پەرەسەندنی ( لەفز ) دەور، خۆیانگێڕا ، لە دارشتەی ووشەی ( ڕزیو ، یان هەڵووڵ ) ووشـــەی فریل (frele) هاتەناوەوە کە پاش چەند سەدەیەك لەمەوە دارشتەی (Fragile) مان بۆ مایەوە • سەدان نموونەی تر هەیە •

**پرسیار : تێکڕا دووجار سوودمان لە لاتینی وەرگرتووە بەڵام ناکۆکی لـــەوە دایە کە لە ئاستی زمانەوانەکانەوە وا باوە کە دورجار لاتینی پەتیمان بەکارهێناوە •**

وەڵام :

ئەمەش بە نزیکی کۆڕینێکە لــــە ئاستی زمانەوانیی‌یەوە لەو جەنگەدا کــە نێوان کۆنو تازەکــاندایە لــــە سەدەی حەڤدەمینەوە •

**پرسیار : ئایا دەربارەی ئەو زمانــە ناوچەییانەی لــــە وولاتی غــــولدا بەکارهاتوون بەر لە گەیشتنی قەیســـەر بۆچوونتان چییە ؟**

وەڵام :

لامان وایە گەلێ لەهجەی ناوچــــەیی هەبووە • لەوەشەوە بۆیدەچین کە حالەتی زمانی هەرێمەکانی ئەمڕۆ دەبینین لــــە بواری غولی ـ رومانی ـ و هەموو زمانە ناو چەیی‌یەکانی وولاتی غولی رومانیی بنەڕەت لاتینیدا • بەڵام دەبێ ئەوەشمان لەبیرنــــەچێت کە لاتینی‌یەکە لاتینیی لەشکری پەڵامارەدەر بـــوو • لاتینی‌یەکی ڕادە نزمو لاتینیی ملهوڕان ئەمەیە ئەو لاتیـی‌یەی غولەکان فێری بوون ، چونکە ئەمە تاکە زمانێك بوو کە دەیانبیستو نەیان دەتوانی بچنە رۆما تا لەوێ زمانی کۆمەڵی مایەدار بزانن • بــــــــەڵام لاتینی‌یەکەی لەشـــــکرە داگیرکەرەکانی قەیسەر زوو بە زوو چەشن چەشنـــیان تێکەوت ، بەرادەیەك جوتیارێکی ناوچەی ئاریجی فەرەنسا کە بە زمانی ناوچەیی دەدوا بیرای بیڕ لە جوتیاریکی ڤالونیای ناوچەی ئەردین نەدەگەیشت کە ئەویش بە لەهجەیەکی ناوچەیی دەدوا • ئیتـــر بەمجۆرەو لەبنەڕەتەوە هەردووکیان بــــە لاتینی‌یەکەی داگیرکەران قسەیان دەکرد • بەم شێوەیە زۆر ووشەی بنەماڵەی لاتینی لە راستیدا لە زمـــــانی رەمــــەکیی رۆمانی‌یەوە هاتووە •

**پرسیار : دیاردەیەکی دڵڕاکێش هەیە باش تێی‌نەگەیشتوم بێگومان چونکە ئێمە لــــە ماوەیەکدا دەژین کە فیــکرەی ( ئیمپریالیەتی زمانی ) لەگەڵ خۆیـــدا هێناوە • جا چۆن گەلەکەمان هــەمووی زمانێکی بێگانە دەگرێ ؟**

**با وادابنێین کە هیتلەر ساڵی ١٩٤٠**

**وای بە خەیاڵدا بهاتایە کە هەموومـــان ناچاربکات بە زمانی ئەڵمانی بدوێین !**

وەڵام : ئەگەر هیتلەر وای‌بکردبــا سەرنەدەکەوت ٠ لەبەرئەوە نا کـــە ئێمە بەرهەڵستیمان دەکرد ٠ بەڵکو لەبەرئەوە کە ئێمە جگە لە زمانەکەی خۆمـــــان پێویستیمان بە زمانێکی تر نەبـــوو ٠ قەیسەریش بۆی نەبوو لاتینیمان بەسەردا بسەپێنێ ٠ چــــونکە هەرچونێك بێت غولەکان دەبــــوو زمانێکیان هەبێت ناخاوتنی پێ‌بکەن ٠ لاتینی تاقە زمانێکی لەباربوو فێربوونی لاتینیش ئاسان بوو ٠ لە هەموو شتێکیش ئاسانتر ئەوەبوو پیــاو زمانێکی دووەمی هەبێت ئەگەر بیــەوێ لەو بازنەیە دەرچێت کە تیرەکەی چل یان پەنجا کیلۆمەترە ، لاشهوایە کە غولەکان لەناوخۆیانداو لەناو خێزاندا سەرومڕ بە زمانی غولی قسەیانکردووەو لەهجەکانی سەڵتی ( نیسبەت بە وولاتی سەڵت ) لـە لادێکاندا بۆ ماوەیەکی دوورو درێـــژ بەربەرەکانی‌یان کردووە ، لەوانەشـــە زمـــانە ناوچـــەییەکانی ئـــەمڕۆی بریتونی‌ی وولاتی بریتاینی فەرەنسا کە کەوتوەتە رۆژاوای فەرەنسا ٠ پاشماوەی راستەو خۆی لەهجـــەکانی غولی ئـــەو

سەردەمە بن‌و خۆیانگرتبێت چــــونکە شوێنەکە لەلایەنی جوغرافیاوە لاچـــەپە

**پرسیار : بابگەڕێینەوە سەر باســی خۆمان ٠ مێژووی زمان ٠ کارەکەتـــان پێویستی‌کردووە کە بیر لە مێـــژووی ووشەکان ، گۆڕانیان ، درێژی‌و کورتی‌و ژیانیان بەهۆی زەمانــــەوە ٠٠ هتد بکەنەوە ٠**

**لەم بابەتانەوە دەڵێن‌چی ؟**

وەڵام : لەڕاستیدا من لەو باوەڕە دام کە لەچـــاو تاکەکانی ووشەدا گۆڕانێکی زۆر رووی‌نەداوە ٠ ئەگەر بگەڕێینـــەوە سەر ئەو هەزارو پێنسەد ووشەیەی زۆرتر بەکاردێن‌و لەمەوبەر باســـمانکرد ، من سەیرم کردووە هەموویان بەتێکڕایی لـــە ( گۆرانی‌ی رولان )دا هەن کە هی سەدەی دوانزدەمینە ٠ بەڵکو ئەوەی زۆر دەگۆڕێ لەفزەو لایەنە دەنگی‌یەکەی ووشـــەیە ٠ بەڵام مانا گۆڕینەکەی کەمە ٠ بەنموونە ووشەی ( فیر Faire وەربگرە کە لـــە ووشەی فاسیر Facera ی لاتینی‌یەوە هاتووە ، لەناو ئەو شەست مانا گرنگەی ( ئەم کردارە ) ئەمڕۆ هەیەتی ئێمـــە پەنجایان دەبەینەوە ســــەر ســـەدەی یانزدەهەم . کەوابێت ناوکە فەرەنسی‌یەکە وادیارە باش چەسپاوە بـــەڵام لەلایەکی

ترەوە ئەوەی زۆر دەگۆڕێت هەمــــــوو ئەوانەیە کە لەسەر رۆخو سەرپەلەکانن • لەم ڕووەوە کە گوێم لێدەبێت دەڵێـــــن فەرهەنگەکەی « لولیترێە » باشـــــەو فەرهەنگی مرۆڤی رۆشنبیرە ، ئەو پەسنە بە شتێکی ناماقوول دەزانم ، چونکە ئەم فەرهەنگە لە رۆژگارێکدا ژیـــــاوە کە کارەباو رادیۆو مێشـــــکی ئەلەکترونیو ئۆتۆمبیلو فڕۆکەی نەبووە • واتا لـــە شارستانەتێکی جیا لــــە شارستانەتیی ئێستامان • ئێستا هەموو رۆژ ووشـــەی ( هـــــــایفی )[٣]و ( فـــــــلاش ) بەکاردەهێنین •• و هیتریش کە ئەوسـا نەبوون ، ئەگەرچی ئەم ووشانەش وەنەبێ ووشەگەلی تایبەت بـــە تەکنولوجی بن ، چونکە ئەو تەکنولوجیەی لێیەوە هاتووە بە شێوەیەکی گرنگ ژیانی رۆژانەمانیان رام کردووە ، بۆ بەڵگەی قسە ئەوە بەسە کە لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ کە تەزووی کارەبا لە کار کەوت دیمان

چۆن ژیانی فەرەنسی شێواو بـــەتەواوی شلەژا • لە مەیدانی زمانیشدا دەڵێین ئەو ووشانەی کە تایبەتین بە کارەباو رادیوو تەلەفزیونو فڕۆکەوانیو گەشــــــتەو پزیشکی لە تاکەکانی زماندا هەن بەڵام بەر لە سەدەیەك کەمتر نەبوون • کەوابێ لە زەمینەی زماندا ئێمەش تا ئێســـــتا ژیانێك دەژین کە لە ژیــــــانی جوتیاری غولییەوە نزیکە • لەکاتێکدا کە زمانی ئیستامان کە بە شێوەی ( استعارە ) یان وێنەی ووشەکانی بــــــوارە نوێیەکان بەکاریدەهێنین بەتەواوی جیاوازە • بــا نموونەیەکی زۆر سادە بهێنینەوە ئەوەیە دەڵێن ( نیشانەی سەوز )[٤] کە زۆر جار دەڵێین ( نیشانەی سەوز دراوەتە یەکێك ) یان ( پڕۆژەیەك نیشانەی ســــــــەوزی وەرگرت ) ئیتر بەم جۆرە بە هــــەزاران تەعبیری نوێ پەیدابوو کە بەر لــــــــە سەدەیەك کەمتر نەبوون . کەوابێ ئەگەر بمانەوێ زمانێك لە حاڵەتێکی تایبەتی وا

(٣) ئەمـــەش ووشەیەکی ئینگلیزییە بەمـــــانا High Fidility ــــەبەستیش لــــەو ئامێـــرە ریکوردەرانەیە کە زۆر بە راستەو دروستیو وردی دەنگ وەکو خۆی تومار دەکەن •

(٤) ئەمەش هەمان تەعبیرە کە دەڵێ « ئاگـرە سەوزە » لـــــە بابەتی ڕووناکیەکانی رێکردن •

دا كە لامان وایە زۆر پاكە چەسپبكەین ، كارەكەمان جۆرێكە لە گێلی ..

**پرسیار : وادەبینم كە زمان چی‌تر بە خۆژی خۆی ناژیت ، بەڵكو لەگەڵ زمانەكانی دەوروپشتی‌دا كارلێكدەكەن ، جا ئێمە لەچاو ئەو هاوسەنگی‌یەی دەرەوەدا لە زمانی فەرەنسی هەڵوێستمان چۆنە ؟**

وەڵام : لە زمانی فەرەنسی‌ی بنچینەییدا نزیكەی ٨٠٪ی لاتینی‌و ١٧٪ی جەرمانی‌یە ( لەمەش مەبەستم ئەڵمانی‌ی ئیستیمارە دەگمەنەكان نی‌یە ، بەڵكو لەهجەكانی سەردەمی ئەوروپایی كەوا ووشە عەسكەری‌یەكانی وەكو كلاوئاسن‌و بەیداخی بەرهەم‌هێنا ) . جا هەموو زمانەكانی تر ٣٪ یەكەی تریان داوینێ . ئەم شتەش لەچاو پێنج هەزار ووشە بنەڕەتی‌یەكە دایە . لە دەرەوەی ئەم چەمەرەدا بەشداری‌كردنەكان بەگوێرەی رۆژگار جیاواز بووە . ئەوەبوو لە سەردەمی « رستن ـ غزل »دا لە ئیسپانیاوە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم یان لە ئیتالیاوەو بە نۆرە :

وەكو ( خەنجەری بەربەری Aefang كە لە (Lecid) دەدۆزینەوە كە مانای ( شیرەو ) ئیسپانەكان لە ( سیف )ی عەرەبییان وەرگرتووە . مۆدەی ئینگلیزییش كە ڤۆلتیر دای‌هێنا چەند ووشەیەكی ئینگلیزیی داینێ ، لە بەرامبەر ئەمەشدا مۆدەی فەرەنسی‌یەكی ئینگلیزانە (Franglais) « كە زمانێكە ئاوێتەی ووشەی فەرەنسی‌و ئینگلیزی تێدایە » ئەوەی لەبیربردینەوە كە ئێمە بەڕاستی ئینگلتەرەمان داگیركردووەو ئینگلیزییش زمانێكە هەر تێكەیشتنێك تێیدا ووشەیەكی ئینگلیزی ـ ساكسونی‌یەو ووشەیەكی فەرەنسی‌ی هەیە هەروەكو بۆ ئێمە لاتینی بێ . ئەمەش چونكە مەلیك گیومی جیهانگیر بۆ ماوەی چەند سەدەیەك زمانەكەی خۆی بەسەر دوا دەریای مانش‌دا سەپاند . بە رادەیەك هەندێ ووشەی كۆنی فەرەنسی كە پەڕیونەتەوە **ئینگلتەرە یان مانایەكی** تایبەتییان هەیەو ئێمە بیرمان‌كردوون پاشان هاتەوە لای خۆمان لەوەو

سەردەمانەوە و هەندێکیشیان تـــــازە گەڕاونەتەوەو مانایەکی تریان هەیـــەو بەخۆمانەوە گرتووە • بەنموونە ووشەی ( پارتیســـــــیون Partition ) ـ دابەش‌کردن ـ کە ئەمڕۆ لـــەفزێکی نوێی ئینگلیزی ـ ساکسونی راستەقینـە پێك‌دەهێنێ بە واتا (دابەش‌کردنی ئیتنام بۆ دوو دەوڵەت ) • ئەمە ووشــــەیەکی کۆنی لەناو تاکەکانی نوســـــــــەرە شــــــەرعی‌یە فەرەنســـــی‌یە کۆنەکاندا وونن‌بووە کە جاران بەمـــــــــــانای دابەش‌کردنی میراتو کەلەپوور دەهات • جا ئینگلو سەکسونی‌یەکان بە ئێمەیـــان دایەوە بەڵام بەو مانا سیاسی‌یەوە کە بەر لە ئێمە لای ئەوان ووشەکە پەیدای‌کرد •

**پرسیار : ئەگەر هەر لەسەر باسی ئینگلیزی بڕۆین ، ئایا شتێك نی‌یە ئێوەی زمانزانەکان زاراوەیەکی زمانەوانیتـان بۆ داناوە پێی‌دەڵێن ( بـــــە مانـــــا ئینگلیزی‌یە ) واتا دەشێ ووشەکە یـــان تەعبیرەکە فەرەنسی بێت بە حەرفی بەڵام ئیجازەکەی ـ ئەگەر راســـتبێ بڵێین ـ ئینگلیزی بێت ؟**

وەڵام : بەڵێ • ئەمە حاڵەتێکە بەنموونە تەعبیری ( Soucoupe Volante ) کـــــە هەر دوو ووشەکە فەرەنسین بەڵام زاراوەکە ئینگلیزی‌یەو تەرجەمەی پیت بـــە پیتی زاراوەی Flyirg Saucer و Flysoucer ی ئەمەریکی‌یە • لە توانادابوو بۆ استدلالی ئەو لەشـــە فڕیوە دیار نەکراوە وێنەیەکی تــــر دابهێنرێت بەڵام ئەمــــە لـــە رێگەی سوودوەرگرتن لـــە کۆنی‌ی تەعبیـــرە ئینگلیزی‌یەکەوە پەیدانەبوو • بەڵـــکو بەوەندە ئیکتیفاکرا کە بکرێ بە فەرەنسی هەروەکو چۆن ئامرازان لە فەرەنسا بـە ئیجازە دروستدەکەن • نموونەیەکی تری لەم تەرزە ، تەعبیری( Rideau defer ) پەردەی ئاسن کە وەکو دەزانن چەرچـــل ساڵی ١٩٤٥ بەکاری هێنا هەروەها گەلێ نموونەی دی هــــەیە ، زۆر ووشـــــەی ئینگلیزی ـ ئەمەریکی هــــــەر بە دەقی خۆیان لـــە فەرەنسی‌دا ماونەتەوە •

پاشـــان پروفیســــور ئالانلورون باس‌دەکات کــــەوا هۆیەکانی راگەیاندن چ ئەوانــــــەی دەخوێندرێنەوە یـــــان دەبینرێن چکارێك دەکەن لـــە مەیدانی بڵاوکردنەوەی ووشەو عبارەتی بێگانە ، بەبێ‌ئەوەی هاوواتایان لــە فەرەنسی‌دا بۆ پەیدابکەن • ئەگەرچی سەرۆکایەتی‌ی

وەزارەتی فەرەنسە فەرمانیدابوو کە دەبێ ووشەی فەرەنسی لە جێگەی ووشە ئینگلیزییەکان لە نامەنووسیی دەوڵەتیدا بەکاربهێنن · پاش ئەمە باسی ئەوە دەکات کە سەرکەوتنو سەرنەکەوتنی ووشەیەکی خوازراوە یان نوێ شتێکی نادیارو ئاڵۆزە ·

دووا پرسیار ئەمەبوو :

بۆ تەواوکردنی فەرهەنگەکەتان چەندتان پێچوو ؟

وەڵام : دە ساڵو نیو ·

**لەگۆڤاری ( آفاق عربیە )وە**
**ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٧٩**
**ع·ب کردوویە بەکوردی**

عبدالرزاق بیمار

وەڵامە راستەکان :

١ ـ ب
٢ ـ ﺣ
٣ ء
٤ ـ ﺣ
٥ ـ ا
٦ ـ ب
٧ ـ ﺣ
٨ ـ ء
٩ ـ ا
١٠ ـ د

# دروشمەکانی قوتابخانەی گەلی

١ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان دەرفەتی نوێن شۆرش بە سەرکردایەتی‌ی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین رەخساندوونی ٠

٢ـ بە سەرکردایەتی‌ی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین چاودێریی قوتابخانە گەلی‌یەکان دەکەین‌و ئامانجەکانیان دەهێنینەدی ٠

٣ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان سەرەتایەکی شۆڕشگێڕانەو تەرزێکی پەروەردەکردنە شۆرشی ١٧ی تەمموز بۆ رۆڵەکانی خۆی دای‌هیناوە ٠

٤ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان وێنەدانەوەیەکی زیندووی بیروڕاکانی حزب‌و شۆڕشە ٠

٥ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان شێوەیەکی پەرەسەندووی شێوەکانی هەڵمەتی نیشتمانی‌یە

٦ ـ چوونە بەر خوێندن لە قوتابخانە گەلی‌یەکان ئامانجی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و مرۆڤایەتی‌ی هەڵمەتەکە دەهێنێتەدی ٠

٧ ـ چوونە بەر خوێندن لە قوتابخانە گەلی‌یەکان ئامانجی پەرەپێدان دەهێنێتەدی ٠

٨ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان دیاری‌ی شۆڕشن بۆ رۆڵەکانی شورش تا بەردەوام فێربن ٠

٩ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان هەنگاوێکی شۆرشگێڕانەیە بۆ دروستکردنی کۆمەڵی یەکگرتوو ٠

١٠ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان خاڵی گوێزانەوەیە لە رێڕەوی دروستکردنی ئیشتراکی‌دا ٠

١١ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان هەلێکی بەنرخە تا هاونیشتمان

باوەڕی بەخۆی‌و بە توانا داهێنەرەکانی خۆی پتەوبکات ٠

١٢ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان وەفاداریی شۆڕشە بۆ ڕۆڵەکانی خۆی لە بارەی هێنانەدیی مرۆڤێکی خوێندەوارەوە ٠

١٣ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان سەرچاوەی تیشك‌دانن تاریکی دواکەوتن لەناودەبەن ٠

١٤ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان پشتیوانی زۆربوون‌و چاككردنی بەرهەم‌هێنانن ٠

١٥ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان واتا پەروەردەکردنی بەردەوام‌و فێربوونی هەمیشەیی ٠

١٦ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان بۆ دروستکردنی کۆمەڵی نوێ توانایەکی گەورەتر بە جەماوەر دەدەن ٠

١٧ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان چەسپاندنی تێگەیشتنەکانی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و ئیشتراکی‌یە ٠

١٨ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان هەنگاوێکی شۆڕشگێڕانەیە ڕووەو بەردەوام‌بوون لەسەر فێربوون‌و پێشخستنی کارزانی‌یەکانی مرۆڤ ٠

١٩ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان هەلی بەنرخن بۆ پێشخستنی ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی ٠

٢٠ ـ قوتابخانە گەلی‌یەکان بەڵگەیەکی زیندووی بایەخ‌دانی سەرکردایەتی‌ی حزب‌و شۆڕشە بە فێرکردنی هاونیشتمانان ٠

٢١ ـ قوتابخانەی گەلی هەموو ووزە ماتەکان هەڵدەقوڵێنێ بۆ بەشداری‌کردن لە کرداری بنیاتی شۆڕشگێڕیی لە هەرێمی تێکۆشەرماندا ٠

٢٢ ـ فێرکردنی گەلی شۆڕشێکی پەروەردەیی بە ئامانجە ٠

٢٣ ـ زانست ڕووناکی‌یەو نەزانین تاریکی ، قوتابخانەی گەلیش دەرگاکانی ڕووناکیت لێ‌دەکاتەوە ٠

